# مەرد و نامەرد

کۆمەڵێک حەکایەتی ئەفسانەی کوردی
بەشێوەی ئاخاوتنی خۆشناوەتی





کۆکردنەوە و ئامادەکردنی
موحەمەد جەمال توتمەیی

**ناوی کتێب:** مەردو نامەرد

**بابەت:** حەکایەتی ئەفسانەیی

**کۆکردنەوەو ئامادەکردنی:** موحەمەد جمال توتمەیی

**پێشەکی نووسین:** م.مەجید عەبدول رەحمان خۆشناو

**تایپ:** شێروان موحەمەد جمال

**پێداچوونەوە:**مەریوان محمد جمال

**نەخشەسازی ناوەوە:** موحەمەد حوسێن خەتی

**بەرگ:** ئیبراهیم صالح

**چاپ:** یەکەم - ٢٠٢٣

---

**لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان**
**ژمارە سپاردنی (٨٣٣)ی ساڵی (٢٠٢٣)ی وەرگرتووە**

# مەردو نامەرد

## کۆمەڵێك حەکایەتی ئەفسانەی کوردی
## بەشێوەی ئاخاوتنی خۆشناوەتی

کۆکردنەوەو ئامادەکردنی
**موحەمەد جەمال توتمەیی**

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

حیکایەت یان چیرۆك یان گێڕانەوە لە دونیای ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیدا شوێنێکی دیارو شیاوی هەیە،ئەو گەڕان و شوون هەڵگرتنەی حەکایەتەکان بۆ چەند مەبەست بووە، لەوانە ( زمان ،ئامۆژگاری ، لەقەدەغە دوان،نزیك بوونەوە لە ئاقیدەی رابردوو) کە رۆژگارێك بیری سەردەمیان بووە،هەر حەکایەتێك بە چەند قۆناغ و زەمەنێك دا رەت بووە،تا گەیشتۆتە ئەمڕۆکە بە تۆمارکراوی دەیخوێنینەوە.

سەرەتای حەکایەتەکان بە هەبوو نەبوو دەست پێدەکات،ئەوەیان هونەری بە نازەمەن کردن و بێ شوێن کران لە حەکایەتان.

ئەفسانە بە کۆنترین جۆری فۆلکلۆر دادەنرێ ، لەبەر ئەوەی وێنەی ئەو کات و ساتە پیشان ئەدات کە مرۆڤ دەستە وەستان وەستاوە بەرامبەر سروشت نەی توانیوە تەفسیری رووداوەکان بکات ، لەرووی سروشت و دەوروبەری ، ئەفسانە هەوڵی سەرەتایی مرۆڤە بۆ تێگەیشتن و ناسینی جیهان و دەوروبەری.

لە ئەفسانەی کۆنی یۆنانی خوای خێرو شەڕی داناوە ،لە ئەفسانەی کوردیش ئەهریمەن و ئاهورامەزدا هەیە، لەئەفسانەی کوردی کێشەو ململانێ لەبەینی هێزی شەڕو هێزی خێرهەیە ، لەنێوان مرۆڤ و دێو و جن هەیە،ئەوەی سەردەکەوێ تەنها مرۆڤی چاکەو پاکە.

لەئەفسانەی كوردی هێزی خێر كە مرۆڤـەدونیای داگیر كـردوەو بـێ ترس دەژی،لەژێر تیشكی رۆژو لە ژێر رووناكی رۆژلەبۆ خێرو خۆشـی و خۆشەویستیش كاردەكات.

بـەلاّم هێـزی شـەڕو تاریكیكـە ژمارەیـان كەمەلـەتاریكی و كونـە ئەشكەوتەكان دەژین و لەتیشكی رۆژورووناكی زۆر دەترسن.

لەئەفسانەی كوردی هێزی شەڕ بەرەو نەمان دەچێت،، وێنـەی مـارو عەزیا كەلە ئەفسانەی كوردیا هەیە،ئەویش وێنەیەكی تـرە لـە هێـزی شـەڕكەزانایانی میسـۆلۆژیا ئـەو شـتە بـە بـاوەڕی ئایینەكۆنـەكان دەبەسـتنەوە،هێزی خێـریش لـە شـێوەی جیـا جیـا لـە ئەفسـانەو حەقایەتی كوردی دەردەكەوێ لەشێوەی پیاو چاك لە چۆڵ و بیابـان دەگاتە ئەوانەی بەدوای مەرامێك دا دەگەڕێن یان ڕێگات ون دەكەن، لەئەفسـانەكان بەخـدری زینـدە نـاوی دەبـەن،میتۆلۆژیا بریتیـە لـە زانستی لێكدانەوەی ئەفسـانەو خورافیـات، لقێكـە لـەو زانسـتەی كـە بەدوای واتـا ئەفسـانەكان و پەیوەنـدی نێـوان ئەفسـانەی كیشـوەرە جیاوازەكان و میللەتەكانی جیهان دەكۆڵێتەوە، میتۆلۆژیا لە ئایین و مێـــژوو و خـــەیاڵ و شـــێعرو ئـــەدەب پێـــك دێـــت، هەقایەتـــە كوردەواریەكانی برای خۆشەویستم محمد جمال بـەدەر نـین لەگـەڕان بەدوای شتە شاراوەكانی ژیانی مرۆڤی كورد، لەزۆربـەی چیرۆكەكان هێزی خێرو چاكەبەسەر هێـزی شـەڕ زاڵ دەبـێ و تێكی دەشـكێنێ، ئەوەش ململانێ ی مرۆڤە لەپێناوی خۆ پاراستن و مانەوەی.

نووسەر بە زمانێکی کوردەواری و بێگەرێ، واتا زیاتر بە زاراوە پاراوی خۆشناوەتی دای رشتوون، وە زۆر وشەی کوردەواری رەسەنی تێدا بەکار هێناوە، بێگومانم خوێنەری ئەمڕۆ کەم پێی هەزم دەکرێ،

ئەوەی جێگای خۆشحاڵی و دەستخۆشیە ، نووسەر فەرهەنگۆکەیەکی زۆر شیاو رێك و پێکی وشەو زاراوەو دەستەواژەکان داناوە، تا کەس لە تێگەیشتنی دا نەمێنێ.

دەستخۆشی لێدەکەم.

م.مەجید عەبدالرحمن خۆشناو

هەولێر، چلەی هاوینی ٢٠٢٣

# چەند وتەیەك

سەردەمێك نەكارەبا هەبوو، نەهۆیەكانی راگەیاندن، نەهۆیەكانی هاتوو چۆ، تەنانەت رادیۆش جگە لە چەند ماڵێكی خوا پێداو،زیاتر بوونی نەبوو،لەشەوانی دوورو درێژی جارانی زستانی گونددا ، لەدیوەخان،دوای نوێژی خەوتنان كۆ دەبوونەوە، لەبەر تیشكی فانۆس و قەندیل و لەمپا،لەبەر سۆبای دارو دابارینی بەفروبارانـدا، دوای خواردنی چایی و كۆبوونـەوەی مێوانـەكان، و حەكایـەت زانـەكان، ئەوانەی قالبووی بواری گێڕانـەوەی حەكایـەت بوون،داوایـان لێدەكرا كەوا حەكایەتێك بگێڕنەوە،ئەوانیش خۆیان گران دەكرد، یاخود داوای ئەوەیان دەكرد كەوا چایە یان قەنداوی بۆ ئامادەبكەن، یـان لەجگـەرە پێچانەوە بێبەشی نەكەن،ئنجا دوای جێبەجێكردنی داواكاریەكـەی دەستی پێدەكردو بەم جۆرە پێشەكیەكەی دەڕازاندەوە:

حەكایەتەكوو لۆكەم كەلام بی

ئاو لەگوێیان سەلام بی

بۆقیَ رانك درویبی

قرژاری هەربرِیبی.

ئنجا بەم شێوەیە دەستی پێدەكرد:

هەبوو نەبوو، كەس لەخوای گەورەترنەبوو، كەس لە پێغەمبەری خۆشەویست تر نەبوو، كەس لەشەیتانی مەلعوون ترنەبوو.كەس لەبەشەری درۆزن روو رەش تر نەبوو.

ئەوجا بۆ ئەوەی خۆی لەراستی و درۆی حەكایەتەكە دوور بێخی،ئەی گوت(بەقسێ ئەو مامۆستایەی ئەمن گوێ لێبووە،)لەحەكایەت گێرانەوەكانیشدا عادەتەن پاڵەوانی سەرەكی داستانەكە لەجەنگدا لەگەڵ دێو و درنج و پیاو خراپەكاندا ناوی (ئەحمەد بووە)،لەزۆربەی چیرۆكەكان دا هەر ئەحمەد گورز وەشێن بووەو دەم ولێوی دێوی بڕیون و لەناو توورەكەیەكی ناون،دواتر لەناو كۆڕی مەدریسدا هەڵیرشتوون، بۆ سەلماندنی ئازایەتی خۆی.

خوێنەری ئازیز، ماوەیەكی زۆر ە ئەو چەند حەكایەتەم لەلایە، لەساڵانی هەشتاكانی سەدەی رابردوو، تۆمارم كردبوون،هیوادارم لەگێرانەوەی كەوەك خۆی دام رشتوونەتەوەو هەریەو زاراوەیەی خۆشناوەتی بڵاویان دەكەمەوە،بەئومێدم سوودی لێ ببینن،ئەو زاراوانەی كەنامۆن لاتان ئەوا لەفەرهەنگۆكەكی كورتیلە ماناكانم شیكردونەتەوە.هەروەها سەردەمی ئەمڕۆ خوێنەر زیاتر حەزی لە بابەت و چیرۆكی كورتە، تاقەتی خوێندنەوەی بابەتی دوورو درێژی نیە، بۆیە كامە چیرۆكی كورتە بۆم هەڵبژاردوون.

هیوادارم سوودێكم بەزمان و كەلتوورو كەلەپووری كوردی گەیاندبی ، لەهەڵەكانم چاوپۆشی بكەن،سڵاو بۆ هەموو لایەكتان.

**محمد جمال توتمەیی**

**هاوینی ٢٠٢٢ - بالیسان،زێلان**

# ژن هەیەو ژنۆکەش هەیە

هەبوو نەبوو پاشایەك هەبوو هەتا برێی پاشایەکی عادل بوو , ئەو پاشایە شەوێ ئەگەڕا بەتەنێ لەناو شاری لۆئەوەی کە بزانی داخوە ئەم عالەمە چەکاو چ ناکا ,

شەوەکێ ئەگەڕا لە کۆرانەکی خۆی دانوساند تەماشەی کردێ ژنەکە بە مێرد حەزی لە کابرایەکی ئەکرد , کابرا ئەیگۆ دەبی مێردی خۆم لۆ بکوژی بیکەیە پرد بەسەری دا تێپەڕم ئەوجا دێمە کنت , ژنێ بە مێرد هەستا بەو شەوەی مێردی خۆی کوشت و کردیە پرد بەس لۆ ئەوەی دۆستی بێتە کنێ ،وەکی کابرای چوە کنێ پاشا چوو مۆرەکی لە دەرکێ دان هەتا سبەینێ بیانبینیتەوە ،ژنەکە هەرستا چی کرد وەکی تەماشەی کرد مۆری لەدەرکێ درابوو ، لۆ ئەوەی کە مارێ خۆی تێدا بزر کا هەرستا دەوری پەنجا شێست دەرکەی مۆر کردن،

سبەینێ پاشای خورام ناردن کە بچن ئەوێ ژنێ بینن ، وەکی تەماشەیان کرد ئەو گەڕەکە هەموو دەرکان ئەو مۆرەی لێدرایە،

گەڕانەوە کن پاشای حارو مەسەلەیان لۆ گێڕاوە پاشا زۆر توڕەبوو بانگی وەزیری کرد گۆتی وەزیر ئەمن چار ڕۆژان لەو شارەی ئەڕۆم ،پاشـی چـار ڕۆژان بێمـەوە یـەك ژن چـیە لـەو شـارەی مـابی و نەتکوشت بن لەسەرتە دەم ، پاشا بەسەفەر چوو ،وەزیـر زۆر بـە عادزی گەڕاوە ماریٚ پیرە باوەکی هەبوو هەندە پیر بوو بوو دەناو قەفـەزێیان کردبـوو ، پـیرە بـاوی گۆتـە وەزیـری کـوڕم چ ژنـان مەکوژە وەکی پاشا هـاتۆوە ئـەمن ببـە کـن پاشـای دوو قسـانی دەگەرەکەم ئێجا بابتکوژێ ،وەزیری گۆ باشە،

چـار ڕۆژ پێچـوون پاشـا هـاتۆوە تەماشـەی کـرد ژن لـە جـاران زۆرتربوون و بەکەیف تر بوون ،گۆتی بانگی وەزیـری کـەن ،وەزیـر چوو پاشای گۆتە جەللادی سەری وەزیـرم لـۆ بـبڕە ،وەزیـری گـۆ پاشا قەیدی ناکا لەسـەرم دە ،بـەس ئێك دەعـوام هەیـە پێشـی بمکوژن ، پاشای گۆت دەعوات چیە؟

وەزیری گۆ پیرە باوەکم هەیە دەناو قەفەزێ دایە بابیهیننـە ئێـرە پێم خۆشە باوی خۆ ببینم ،

چوون باوی وەزیریان هینا ،باوی وەزیری گۆ پاشا لەبەر چ سـەری کوڕی من ئەبڕی ،پاشاش بەسەرهات لۆ گێڕاوە ، باوی وەزیری گۆ پاشا ژن هەنەو ژنۆکەش هەنە ئەتوو بەواستەی ژنەکێ کوو هـەموو

ژنان ئەکوژی ژن هەموو وەکی ئێك نینە با بەسەرهاتیێ خۆت لۆ بگێڕمەوە:

پیرە باوی وەزیری گۆ سوارەك بەو شارەی فێربوو بوو هەموو شەوێ دات بانگی ئێکیە کرد کابرا داتە دەرێ سوارەکە کابرای ئەکوشت ، ئۆرە هاتە سەرە من هێواریێ هەسپی خۆم زین کردو وەکی عالەمێم نەکرد خۆم حازر کرد، نیوەی شەوێ بانگی کردم و گۆتی حازری گۆتم بەرێ حازرم ،ئەو گەیشتە پێش دەرکێ و ئەمنیش سواری هەسپی خۆ بووم و وەدوی کەتم زۆریشە ترسام لە ڕێیێ چوونکە لەمنی دوور بوو وەختەکی گەیشتینە شاخەکی گەورە سوارەکە هاتە خواریێ و گۆتی وەرە هەسپم لۆ بگرە، ئەمنیش چووم هەسپم لۆگرت سوارەکە پارەوان بوو تەختە شاخەکی برند کردو چۆوە ژۆریێ دێوەك لەوێ بوو کوشتی و هاتە دەرێ بانگی منی کردو گۆتی ئەمن ئەوێ دێویێ حەفت برایا لێکوشتیمە شەوێ داتم کە بانگی ئێکەکمە کرد لۆ هەندێم بوو بەس هەسپم لۆ بگری هەتا دێویە کوژم، هەرچی بانگمە کردیێ بە کراس و دەرپێیان داتە دەرێ ئەمنیش لە خەفەتان ئەکوشت لەتووم زیاتر چ پیاوی دی نەدی ، سوارەکە نیقاشی لەسەر سەرو قالبی خۆ هەرگرت تەماشەم کردیێ ژن بوو، گۆتی ئەمن حەفت برام هەبوون هەر حەفت برام ئەوێ دێویێ کوشتن ، بڕیاریشم دابوو هەر پیاوەکی لەگەرم بیێ مارەییێ من لەوی هاتبی ، هاتینەوە

شارى و لە خۆم مارەكردو ئەو وەزیرەى بەتەماى بیكوژێ لەو ژنیە ، پاشاى گۆ وەڵلاهى ڕاستە ژن هەنەو ژنۆكەش هەنە ئەوا ئازادم كرد.

ئەمنیش هاتمۆوەو چم پێ نەبڕا .

---

ئەم حەكایەتە سلیمان فەتاح صالح لۆى گێڕامەوە

خوێندەوار

تەمەن٥٤ سال

خەڵكى گوندى توتمە

ساڵى ١٩٨٨ لەتۆرنوگاى شكارتە لۆى گێڕامەوە

## فەقێ مەحمودی زیرەك

مــەحمود هەرلــە منــدارییێوە منــدارەکی زیــرەك و زۆرزان و ژیکەلــە بوو،ئەچــووە نــاو مەدریســـان و گــوێی لەپیرەمێردانــەگرت و زۆری بەدیقەت و حەزی لە زانینــێ هــەموو شــتەکیە کــرد، داك و باوانیشــی داخوا بــەس ئــەو کورەیــان هەبوو،هەرچــی کۆتبــای لۆیــان جێبــەجێ ئــەکرد، هەرســتان لەبــەر خوینــدنێیان دانــا، چــووە نــاو فــەقێیان،لۆ مەسرەفی خویندنێ مــەحمودی داك و بــاوی ســەبر ســەبرە ئەشــیای مارێیانە فرۆشت ،هەتا خویندنێ تەواوەکات، هەموو جا وەکی فــەقێ مەحمود داتۆ مارێ هەستیەکرد ماریان هەر کمە بیتۆ، رۆژەکێــی لــێ پرسین کۆتێ: ئۆباو،دایێ ئۆلۆ مارێ مە هەرکمە بیتۆ؟

ئــەوانیش گــۆ: کــورم چــت لێوەشێرین،هەمووشــتێ لــۆ مەســرەفی خویندنێ توو فرۆشت، پێێ خۆش نەبوو ئی موحتاج بی، ئی بێ جلك بی، پێێ خۆش بوو لەناو فەقێیان دیاربی.

فەقێ مەحمودی فکر کردێ،کۆتیە داکو باوان: مادام وێیە دەبی لێــرە برۆین، پێم خۆش نیە لــەو گونــدەی بمینێینۆ،وەچــاکە بــرۆین لۆخــۆ لەجێیەکی دیکە بژین و کاسبیێ بکەین،خویندنیشــما تــەواو کردیــە،

ئەچین لەجێیەكی دی دەرۆژێش و لۆ بكەم لێناگەرێم موحتاج بن.هەرستان شاری خۆیان بەجێ هێشت و رۆیشتن،گەیشتنە شارەكیدی،پاشای ئەو شاری زۆر دەگەر خەركی ئی باش بوو، لەچاكەو پیاوەتیێ دەنگی دابۆوە،فەقێ مەحمود چووە دیوانێ پاشای و بەخێراتنەكی گەرمیان كرد،فەقێ مەحمودی گۆتە پاشای: پاشام خۆشبی،ئەمن ماوەكە خویندنم تەواو كردیەو بەحسی چاكەو پیاوەتیێ تووم زانیە،هاتینە كنەتوو،داك و باوێ من هەرچی مار هەبوو،هەموویان لۆ خویندنێ من فرۆشتیە،ئەمیش پێخۆشە،لەباتی هەندێ خزمەتیان بكەمۆوە، پاشاش ئەمر كردو گۆتی،فەقێ مەحمودمارەكەباش لۆ داك و باوامن دانێم،ئەتووش بەكەیفێ خۆبە،لێرا مینێیۆ یان كێواچی كەیفا خۆتە.

فەقێ مەحمودی وەگۆ: ناوەڵلا پاشام خۆشبی، ئەتوو ئێك شتی دەگەرەمن بكە، باداك و باوم لێرەبن،تاقمە جلكەكی جوانم بدێ دەگەر هەسپەكی،پاشاش ئەمرەكانی جێبەجێ كردن،فەقێ مەحمود سواری هەسپی بوو و لێیدا رۆیشت.ئەو شارەشی بەجێ هێشت و رووی دەچۆلیان كردو پشتی دەئاوەدانیان، هەر رۆیشت وەختەكی گەیشتە سوارەكی،ماندی نەبوونی لێكردو گۆتیە سواری كێواچی؟سواریش گۆ: كاغەزەكم وێیە لۆ حاكمی ئەو شارەی لە پێشیتن، فەقێ مەحمودیش كاغەزەكەی لێوەرگرت و خویندیۆوە و دیتی نویسرایە(هەروەختەكی ئەو كابرایە گەیشتە كنت ،عەلەل

هەجەلە بیكوژن)،فـەقێ مـەحمودیش راسـتیەكەی پێـئـەرێ و ئیـدی سـوارەكە ئەگـەڕێتۆو زۆر دوعایـان لـۆ فـەقێ مەحمودیەكات،لـەوێڕا فــەقێ دەسـت بـە ڕۆیشـتنی كـاتۆو ئەگاتـە ئـەو شـارەی كـە مەخسەدیتی،ئیدی جـەرەوێ هەسپی شـلەكات و ئـەرێ هەسـپ چـۆ كێنـدەر، ئەچـمە وێندەر،هەسـپ بەكـەیفێ خـۆ ئـەڕواو ئەچـیتە مارەكێ،وەكی تەماشـاكات،ئەو مـارە پیرەژنۆكەكـە لەسـەر دەسـتێ خۆ ژی ،فەقێ ئەرێتـە پیرەژنـێ: ئـەرێ مـارێ،كی لەوێیـە ؟مێوانـان راگرن؟بێمە ژۆرێ؟.

پیرەژنیش جوابێ داتۆ و ئەرێ: مێوان بـەخێربێ سـەر چـاوان،مێوان مێوانی خوایە،مار بە مێوانان ئاوەدانە،فەرموو وەرە ژۆرێ.

فەقێ مەحمود ئەچیتە ژۆرێ و پیرەژنی زۆر خزمەتەكات، پاشی نـان خواردنێ،فەقێ مەحمود ئەرێتە پیرەژنێ:ئەرێ پلكێ لەو شارەی نكۆ چ بەحسە؟چ هەیە؟ چ نیە ؟

پیرەژنیشەرێ:وەڵلاّ كەسی پلكێ،شارەكی خۆش و بێ كێشەیە،بەس پاشـای كیژەكـە هەنـدە مـەكرباز و حیلەبازهەیە،هـەر جحێرەكـی ئەچیتە داخوازیێی بەهانانی پێهەرەگری، هەندەك پرسیاری هەنە كم كەسـە زانـی جـوابێی بداتۆ،تەماشـەی ئـەو قەسـرامێ كـە هـەمووی بەسـەركە بەشـەران دروسـت كردیە،هەركەسـەكی بچیتە داخـوازییێ جوابێ پرسیاران نزانی،راست و راست لەسەریەدا.

فەقێ مەحمود ئەرێتە پیرەژنێ:بەخوای دەنا پلکێ ئەمنیش لۆوی مەسەلێ هاتیمە،هەرچەندی پیرەژنی رەجایێ لێکا،ئەی رێتێ مەچوو،کورم خۆ مەفەوتینە،فەقێ ئەرێ بەخوای پلکێ سەرەکەو هیتایتم ناگەرێمۆ،ئەمیش وەکی ئەو خەرکەی ئەوا ئەچم ،جا بەتەمای خوای.

هەرکوورەکی هەبی فەقێ مەحمود خۆ گەینیتە کن قەسرێ پاشای و ئەرێتە خورامان وەبرێنە پاشای مێوانەکت هاتیە،پاشا ئەرێ بابێتە ژۆرێ، فەقێ مەحمود ئەچیتە کن پاشای و سەلامێ لێکات،پاشا ئەرێ:هاکورم خێرە لۆچ هاتی؟

فەقێ مەحمودیش ئەرێ: وەللاهی قوربان ئەرێن کچەکت هێیە ، و ئۆین بازو زیرەکە، ئەمیش هاتیمە هەتا بزانم ئەمنیش وەکی خەرکی سەری خۆ دائەنێم، یان ئەیبەمەوە.

پاشا زۆری لێپارێتۆکەواز لەچوونێ بینی و ئەی رێتێ کورم ئی گەنج و جحێری،چیشت بەو ئیشانەدایە، وەدوو ئیشی خۆ کەوە باشترە.فایدەی نەبوو، فەقێ گۆتی تازە هەرهاتیمە بەتەمای خوای.

پاشای بەجێدێری و ئەیبەنە کن کیژێ پاشای ناوی(فەرەحنازە)،

فەرەحناز وەکی ئەیبینی ئێکسەر دۆخینێ دەرپێیێ ئەپسێ، لەدری خۆدا ئەرێ:وەکی لۆ یەچم لەئاخیری گونە رەشی خۆم گەیشتێ، لەچاوانی را دیارە لێی نابەمۆ، زۆری بیژی مۆتە دیارە،

لەسەت ئاوانیدایە و تەڕە نەبووە،دەی بابزانین شەڕە مەترەقی من و فەقێ مەحمودی كووە بی.

ئە رێتە فەقێی: كوڕی چاك بە پێم خۆش نیە بتكوژم لەسەر ت دەم ، بەمن بی لەخۆ تێك نادەی و قەسرێ بەجێ بێرە.

فەقێ مەحمودی گۆ: هەی لەمنت نەكەوی، بەرخی نێر لۆ سەربڕینێ باشە،وەرە مەیدانێ، قوڕت وەسسەری تازە لەدەستانم قوڕتار نابی.

فەڕەحنازەرێ: بەخوای بەدرم سوو لێبیۆ،سەری خۆ بەفەتاڕەت مەدە،ئەوجارەشتەرێمێ، زو خۆ قوڕتاركەو لەپێش چاوانم هەلاكۆ.

فەقێ مەحمودەرێ: فرتەفرتی ناوێ،پرسیارێ خۆ بكە،چما بەتەمای لەدەستانم قوڕتاربی.

ئەوێ شەوێ هەرلەپاشی عیشایێ، لەقەسرێ مەنیجایێ،بووە پرسیاركردن لە فەقێ مەحمودی، هاتا سێ پش لەشەوێ چوون،هەموو پرسیاری جواب دائۆو،پێشی بانگی سبەینێ فەقێ مەحمودی گۆت: مەنیجا، بەهەموو عورف و عادەتان ، ئەتوو هەنووكە مارەبیت لەمنا هاتیە، خۆ بامەدەو واز لە فرت و فێران بینەو بانگی باوی خۆ بكە هەتا لێكن مارەكات،

پاشی بانگی سبەینی و دوای نوێژكردنێ، فەڕەحنازێ خواردنەكە شاهانە لەكۆشكی عازركردو بانگی باو وەزیرو گزیرو مەلاشیان بانگ كرد، پاشی نان خواردنێ، فەڕەحنازێ گۆت:

تۆ چەند سارە ئەمن کەسەکی وەم نەدیتۆ پرسیاریٚ من جواب داتۆ، لەو فەقیٚ مەحمودەی زیاتر، هەموو تەلەسماتەکانی بڕین، هەموو پرسیاریٚ منی جواب دانۆ، لۆییٚ دەعوا لەباوی خۆ کەم ئەمن بەحەراری بداتە ئەو عەگیدەی،پاشای ئەمر کرد و گۆتیە مەلای تازە ئەوانە حەراری ئێگدینە،ناوێ خوای لێبینەو لێکیان مارەکە،بووە شایی و بەزم و رەزم، حەفت شەوو حەفت رۆژان بووە شایی و لۆغان.

پاشاش هەنگینیٚ ئەمر کرد، کە دەبی لەجێی من دابنیشی ،گۆتی پاشایەتی هەرلۆ فەقیٚ مەحمودی باشە.

فەقیٚ مەحمود چووە دوو داك و باوان و هینانیە کنە خۆ،هەتا مان بەخۆشی ژیان.

ئەمنیش چ پیٚ نەبڕا.

---

ئەو حەکایەتە خوا لێی خۆشبی:حاجی قادر عەولا بەگ لۆی گێڕامەوە،تەمەن ٧٥ساڵ.

# مەردو نامەرد

هەبوو نەبوو مەردەك و نامەردەك هەبوون ،ماوەكی زۆر بـوو وێكـڕان بوون، هەر ئێكی هەشت تۆ دە نانیان وێبـوون ، وەكـی وەختـی نـان خواردنێ دادات مەردی نان دینا دەرێ ئەیان خواردو نامەردیشـە گۆ با نانی من لۆ دوایێ بی ، هەتا وەیلێهات نانی مەردی خـەلاس بـوو ، وەختەكی مەرد برسی بـوو گۆتیـە نامـەردی بینـە بـا نـانی بخـۆین ، نامەردی گۆت وەللاّ ئەمن نانی خۆت نادەمێ ، مـەردی گـۆت كـوڕە ئەدی نانی منت هەموو دەگەرە من نەخوارد : نامەردی گویێ نـەدایێ گۆتی بەخوای یەك پەلكە نان چیە نایخۆی

مـەرد لـە نامـەردی جـودا بـۆوە هـەر ڕۆیشـت ڕۆیشـت هـەتا شـەوی بەسەردا هات لەبرسان و لەسەرمان چوە نـاو ئەشـكەفتەكی ،خـۆی لە كەلێنەكی شاردۆوە ،نیوەی شەوێ وەختەكی لـێ ڕامـا شـێرەك و گورگەك و ڕیویەك هاتنە شكەفتێ ، هەر ئێكـی پیسـتە حەیوانـەكیان وێبوو لەبنە خۆیـان ڕاییخسـت و ئاگریـان هەركردومەدریسیان دانـاو خەریكی شەو چەرە خواردنێ بوون، هەرئێكی بەحسی ئیش و كـارێ

خۆیەكرد، شێری گۆ : فرانە گردی دوازدە كوپە زێڕا تێدانە وەرە كەس پیێ نزانی،

گورگیش گۆ لەپێش ئەویێ شكەفتیێ سۆرە مشكەكی لێیە هەموو سبەینان دێتە دەریێ هەندی لیرە وێنە گەمان پێكا هەتا وەڕزەبی دوایێش ئەیان باتۆوە ژۆریێ ،مەردیش ئەوا گویێ دایتیێ

ریویش گۆ/ دەنا پاشای فرانە شاری كیژەكا هەیە عیللەتەكیا گرتیە گرور بوە هەموو ڕۆژیێ دوختۆرو لوقمان دەرمانانی لۆ دانێن بە هیچ چانابی و دوختۆرو لوقمانەكانیش ئەكوژن ،ئەوی بچی كیژیێ وی چاك بكاتۆوە پاشا كیژیێ خۆی ئەداتیێ و لە جێی خۆی دانیێ ، فرانە شوانی دوو تولە وێنە ،ئیێ لەو تولانە بكوژێتۆوە ،خوینیێ ئەو تولەی دە قالبی بدریێ چاكەبیتەوە ، وەختی بەیانی هەرسیێ دەعبا ڕۆیشتن هەركەسە لۆ ئیشی خۆی ، مەرد لە شكەفتیێ هاتە دەریێ تەماشەی كردیێ سۆرە مشك لە پێش شكەفتیێ لیرەی وێبوون گەمەی پێكردن ، مەرد ڕاوەستا هەتا هەموو لیرەی هینانە دەریێ بەردەكی گرتە سۆرە مشكی و كوشتی و هەموو لیرەی هەرگرتن و ڕۆیشت لۆلای گردی تەورو خاكەناسی پەیداكردن ، عاردی هەرقەنی تەماشەی كردیێ دوازدە كوپە لیرەی تێدابوون هەمووی دەناو گوشەكی كردن هاتەوە شاری ، چوە كن شوانی گۆتی ئەو تولەی بە چەندی ئەفرۆشی شوانی گۆ تولە فرۆشتنی لەسەر نیە بیبە لۆخۆ تولەی میناو چەنگە لیرەكی دا شوانی ، تولەی كوشتۆوە ، شوشەكی پڕی

خوین کرد و چوە کن ماریٚ پاشای گۆتیە پاشای پاشام خۆشبی دەرمانەکەم هینایە ئەمن بەشەرتت دەگەرەکەم ئەگەر ئەو دەرمانەم دە قالبی هەرسوی بە ماوەی حەفتەکی چانەبۆوە بم کوژە پاشای گۆ باشە ، خوینیٚ تولەی سیٚ جار دەقالبی هەرسوی لۆ ماوەی شەش ڕۆژان سیٚ تفری هاویشتن و چاك بۆوە ، کیژیٚ پاشایان لە مەردی مارەکرد پاشاش گۆت کورم ئەمن بەکەلك پاشایەتییٚ نایێم زۆرا پیر بویمە ، لە جێی خۆشی داناو بوە پاشا،

ڕۆژەکی نامەردی چووە کنیٚ وەیگۆتیٚ باشە ئەتوو کوو ئەو هەموو مارت وەدەستکەت و کوو بویە پاشا؟

مەردی جواب داوە گۆتی وەکی لەکنە تو ڕۆیشتم شەویٚ چوومە شکەفتەکیٚ ریویەك و گورگەك و شێرەکی هاتنیٚ دەستیان بە قسان کردو گۆتیان : فرانە جێی زێرا لێیە ،پێش شکەفتیٚ لیرە لێنە، بە فرانە دەرمانیش کیژیٚ پاشای چاکە بیتۆوە ،نامەردی وەکی گویٚ لێبوو گۆتی وە چاکە ئەمنیش وەبکەم ، هەستا چوە ناو شکەفتیٚ خۆی لە جێیەکی شاردەوە ،نیوەی شەویٚ شێرو گورگ و ریوی هاتن ئاگریان هەرکرد و دەستیان بە قسان کرد، ریوی گۆت باشە ئەمن ئەوڕۆ شوان دیت تولەی دەگەر دانەبوو چ مەعنایە،گورگیش گۆ سۆرە مشکیشیان ئەوا کوشتیە زێریشیان ئەوا بردیە ،شێریش گۆ بەخوای ئەوڕۆ چوومە تەماشەی گردی هەر دوازدە کوپە لیرەیان ئەوا هینایینە دەریٚ ، گۆتیان شەویٚ دی زەلامەك لێرەبووە گوێی

لەقسێ مە بووە لۆیێ ئەو شتانەی زانینە، گۆتیان دەبی ئەوشەویشی كەس لێ نەبی با شكەفتێ بنۆڕین ،شكەفتێ گەڕان نامەردیان دیتۆوەو پارچە پارچەیان كرد

ئەمنیش هاتمۆوە چم پێ نەبڕا.

---

زرار مولود ابراهیم

خەڵكی تونمە

تەمەن٦٠ ساڵ .

خوێندەوار

ئۆردوگای شكارتە ١٩٨٨

# مام صابر

ئەگێڕنەوە ئـەڕێن کابرایـەك هـەبوو نـاوی مـام صـابر بـوو ،ئـەو مـام صابرە هەتا بڕێی فەقیر بوو جوەکی جیران بـوو ئـەو جـووە توجـار بوو ،ژنیَ مام صابری ڕۆژیَ ئەچووە ماریَ جووی ئیشی لۆ ئەکردن و هێوارانی چار نان دینان ئێك لۆخۆ ئێك لۆ مێـردی هەردووکێـدیش لـۆ کوڕانی دوو کوڕی گچکەشی هەبوون،ڕۆژەکیَ جووی توجار ژنیَ مام صابری دەناو صندوقەکی ناو هاویشتیە ناو باری و دەگەرەخۆی برد لۆ توجارەتییَ ،ژنیَ مام صابری زۆرە جوان بوو جووی تەماعی تێوە کردبـوو لۆیێشـی دەگـەرە خـۆ بـرد، مـام صـابری فـەقیر چ چـارەو مەفەری نەمان گۆتی وە باشە ئەو دوو مندارارنە ببەمەوە لای خزمان ، خزمیشی لە گوندەکی دی هەبوون ، هەرستا هەردووکی لە ئـامێزیَ کردن ، تووشـی ڕوبـارەکی هـات ئێکـەکی لـەو بـەری ڕوبـاری دانـا و ئێکیشی لە ئامێزیَ کردو گەیشتە ناو ئـاویَ ئـاوڕی داوە گـورگ هـات منداری ئەوبەری بـرد ،لـەتاوانی منـداریَ ئـامێزیَ لـە دەسـتی کەتـە خواریَ و بە ئاوێداچوو،ئەوی گورگی بردبوو شوانان لیَ ستاندەوەو بە خێویان کرد ،ئەوی بە ئاوێشدا چوو ماسیگران گرتەوە ئەوانیش ئـەو

بەخێو کرد، مام صابریش لە عێدزیان ڕۆیشت گەیشتە شارەکی ، لە ڕێیێ گۆتیە کابرایەکی دەبی کەس چ خورامان ڕانەگری گۆتی ناوالله بەرا پاشای ئەو شارەیا مردیە هەڕوو تازیەیە تێری نانی بخۆ ،گەیشتە ناو شاری چووە مزگەفتێ فاتیحەکی خویندو تێری نان خوارد هاتە دەرێ تەماشەی کرد عالەمێ شاری هەموو خڕبویتۆوە چووە کن قەرەبارەغیێ گۆتی ئەو قەرەبارغیە چیە ؟ گوتیان ئەوا پاشای هەرەبژێرن ،بازی هەرەدەنە عاسمانێ لەسەر سەری کێ هەرنیشتەوە ئەو پاشایە ، بازیان هەردا باز گەڕا گەڕا تا گەیشتە سەر سەری مام صابری و نیشتەوە ،گۆتیان باز غەرەتی کرد ئەوجارەیان تێفرەدا دیسانێ لەسەر سەری وی نیشتەوە هەلیشی سێ جارە ، گوتیان باز دیسان غەرەتی کرد ،چوون مام صابریان لەناو غورفەکی کردو دەرکیان لەسەر قەپات کرد و بازیان هەرداوە باز دیسان گەڕا گەڕا هەتا ئەو خانیەی دیتۆوە دە پەنجەرێدا چوە ژۆرێ و لەسەر سەری نیشتەوە ، مام صابریان هینا دەرێجلکێ پاشایان دەبەر کردو بووە پاشا،

بابچینەوە سەر بەحسی کوڕانی بزانین چیان لێهات ئەوەی لەکن شوانی بوو گەورەبوو لۆ خویندنێ ئەگەڕا ،ئەوی لە کن ماسیگرانیش بوو بە میسالی لە دوو ڕیانەکی گەیشتنە ئێگدی و ماندی نەبونیان لە ئێگدی کرد سوئالیان کرد لێکدی کێوا چی کێوە ناچی ؟ هەردووکان گۆت لۆ خویندنێ ئەگەڕێم،بوونە ڕەفیق لە ڕێیێ ئێکی لە ئیدی

پرسیار کرد کوڕی کێی و کوڕی کێ نی ؟ هەردووکان حارو مەوزوعێ خۆ لۆ ئێگدی گێڕاوە دەستیان هاویشتە ملێ ئێگدی تێریان ئەولاو ئەولای ئێگدی ماچ کرد گۆتیان ئەمە تازە ئێکدین دیتەوە بەرا کوو داك و باوان ببینینەوە ؟

ڕۆیشتن چوونە ئەوشاری باویان لێ بوبتە پاشا ، پاشای زۆر حورمەت گرتن و هەردووکی کردنە ئەمینداریێ خۆ چونکە هەند ئە دەستپاك بوون پاشا لە هەموو شتەکی لێیان ئەمین بوو، ڕۆژەکێ جوو لە گەڕانەوێدا بەوشارەی داهات لەتوجارەتی ئەچۆوە ئەو جوەی کە داکێ ئەو دوو کوڕانەی وێیەو دەناو صندوقێی نایە ،شەوێ چووە کن پاشای و گۆتیە پاشای پاشا ئەمن توجارم ئەشیام زۆر وێیە مادام ئەتووش پاشای ئەو ئەشیایە ئەمانەتی تووە هەتا سبەینێ ،پاشاش گۆتێ خەمت نەبی دوو کەسی هەند ئەمینت لۆ ئەکەمە حەرەس کە یەك ئەشیا نەدزرێ ،هەستا بانگی ئەو دوو کوڕانەی کردو گۆتی ئەو ئەشیایە ئەمانەتی ئەنگۆیە دەبی ئەوشەو حەرەسیاتی لێبگرن ،گۆتیان باشە شەوێ چوونە کن ئەشیای جووی توجار لەتەنیشت صندوقێ دانیشتبوون سەربردەی یەگدیان لۆ ئێگدی ئەگێڕاوە پیکەوەیان وەکۆ ئەمە ئەوە خوا ڕوحمی کرد ئێگدین دیتۆوە بەس بریا داك و باویشن دیتبانۆوە، داکیشیان ئەوا لەناو صندوقێیە ،داکێیان هاوار کردو گۆتی ئەمن داکێ نگۆمە هینایانە دەرێ ئێگدیان ماچ کردو شەوێ ئێکی سەروە باسکی کردو ئیدیش سەر وە باسکی

دى كردو خەويان لێكەت ،سبەينىٚ زوو جوو چوو تەماشەى كردىٚ ئەوا دوو كەسان سەر وەباسكى ژنەكەى كردية،غاريدا چووە كن پاشاى گۆتى پاشا ئەمن شەوىٚ ئەو ئەشيايەم ئەمانەتى توو كردبوو ئەمانەت لەلاى ئيسلامان شتەكى زۆر گەورەيە ،ئەو دوو حەرەسانە شەوىٚ تەعەروزى ناموسىٚ منيانا كرديە ، پاشا زۆر توڕەبوو ئەمرى كرد لەسەريان دەن نامەوىٚ جارەكى دى بيانبينمەوە ، وەزيرەكى گۆت پاشا با مەحكەمەيان بكەين ئەوجا هەنگينىٚ لەسەريان ئەدەين

حاكم دانيشت گۆتيە كوڕەكان ئەنگۆ شەوىٚ دى لۆ چوينە كن ژنىٚ ئەو توجارەى ،گۆتيان وەڵلا بابە ئەو ژنە داكىٚ خۆيەتى ئەمە كوڕىٚ ئەو ژنەينە ئەو جووە توجارە داكىٚ مەى لەسەرە مە هەرگرتيە لەناو صندوقێى نايەو برديتى پاشاش ئەوا گوىٚ لێيە پاشاش گۆت مادام وەبى ئەنگۆ برابن و ئەو ژنەش داكو بى ئەمنيش باوى نگۆمە، جوويان هينا لەسەريان داو هەموو پێك شادبونۆوەو ئەمنيش هاتمۆوە

---

زرار مولود ابراهيم

# سێ کوڕە پاشا

پاشایەك هەبوو سێ کوڕی هەبوون پاشا زۆری شرپبوو وەختی مردنێ بانگی هەرسێ کوڕانی کردو گۆتی ئەمن ئەمرم پاشی من لەنگۆ لەهەرسێکان کوڕەك بارنج بی پێی نەکرا وەبرێ کیهە کوڕ بارنج بی وەکی عیزرائیلی ڕووح کێشا ، پاشی تازیێ کوڕی گەورە ئەگۆ ئەتوو بارنجی ئەوی دی ئەگۆ ئەتوو بارنجی دوایێ پێکهاتن کە بچنە لای برادەرەکی باویان کە هەم پاشا بوو هەم مەلاش بوو وەڕێکەتن گەیشتنە جێیەکی برا گەورەی گۆت ژنەك بەو ڕێیەی دا تێپەڕیە برای ناوەنجی گۆت ئەو ژنە حامیلەشە برای گچکەش گۆت ئەو ژنە لەمێردی خۆ تورەبوە زۆر ئاوریشی لە پشتە خۆ داینۆوە چاوی لە دوو مێردی بووە مێردی ژنەکەیان گەیشتێ گۆتی چ ژن و نەدیتینە بێرەدا تێپەڕی ؟گۆتیان ناوەڵاهی نەندیتیە کابرای وەگۆ وەڵلاهی ئەنگۆ ئەوا دیتیتو تازە پێشی ئەمن بێم بەعسی ژنێ منوە کرد، قسەك لەوان و ئێك لەوی زۆری نەمابوو بەشەڕ بێن ،دوایێ برایەکان گۆتیان باشە برا دە دەگەرەمە وەرە ئەمە بەخۆ لۆ شرعێ ئەچین ئەتووش دەگەرەمە وەرە ، کابرایان وەگەرکەت گەیشتنە جێیەکی

دی براگەورەی گۆت حوشترەك بێرەدا ئەوا تێپەڕیە ،برای ناوەنجیش وەگۆ بارەکیشی لێبووە لایەکی ڕوون بوە لایەکی هەنگوین بووە ،برا گچکەش گۆت ئەو حوشترە چاوەکیشی کۆرە بووە دەو قسانە دابوون ساحێبی حوشترێیان گەیشتێ پرسیاری حوشترێی لێکردن گۆتیان نەندیتیە ،کابرای گۆت ئەدی کوە زانن بێرەدا هاتیەو ڕوون و هەنگوینی لێبوەو چاوەکی کۆرە بووە ، برایەکان گۆتیان تورەبوونی ناوێ ئەتوش دەگەرن وەرە بچینە لای مەلای لۆ شرعی، ئەویشیان دەگەرەخۆ بردو گەیشتنە مارێ پاشای و سەلامیان کرد و گەلەکیان بە خێرهینان ، برایەکان گۆتە پاشای ئەمە هیچ شرعن هەیە لەکنەتوو بەس ئەو دووانەش شرعا هەیە ئەوان زوو وەڕێکە، گۆتیە ئێکی ئەتوو شرعت چیە ؟ کابرای گۆت ئەمن لە ژنێ خۆم ئەتۆری لە ڕێیێ گەیشتمە وان بەحسی ژنێ منیان ئەکرد وەشم گۆتنێ ژنێ منو نەدیتیە گۆتیان نەء ، پاشای گۆتە برا گەورەی کوو و زانی ژنێ وی بەوێ دا تێپەڕیە برا گەورەی گۆت ڕێ قوڕ بوو جێی پێراوانی دیار بوو گۆتیە برای ناوەنجی ئەدی ئەتوو کوو زانی حامیلەیە ؟ برای ناوەنجی گۆت بەهەندێم زانی شاقاوی کورت هاویشتبوون و بە هوردی ڕۆیشتبوو ، ئەدی برا گچکە ئەتوو کوت زانی ئەو ژنە پشێمانی بوو ؟ برای گچکە گۆت لە ڕۆیشتنێ ڕا دیار بوو جێی پێیانی دیار بوو کە هەر شەقاوەکی ڕۆیشت بوو پێراوی سوڕاندبۆوە ئاوری لۆ پشتە خۆ دابۆوە داخوە مێردی بەدوو دا نایێ ،پاشای گۆت بابم لەسەر قسێ ئەوانە هەڕوە

دووژنێ خۆ دیارە چاوی لەدووی ، ئەوانە وەجاغ زادەنە هەموو شتەکی ئەزانن، کابرا بەغار ڕۆیشت ،مایتۆوە ساحێب حوشتر ، وەیگۆتە برا گەورەی کوت زانی حوشتر بە ڕێییدا تێپەڕیە برا گەورەی گۆت قوڕبوو جێ پێی حوشتران لە چاو هەموو وراغێ دی دیارە ،ئەدی برای ناوەنجی ئەتوو کوو زانی لایەکی ڕوون لێیەو لایەکیش هەنگوین ،گۆتی لەهەندێم ڕا زانی لە جێیەکی کەتبوو لای ڕوونی مێش لێ هەرنیشتبوون لای هەنگوینیشی لێندرابوو زەنگەتەی لێ نیشتبوون ، ئەدی برا گچکە ئەتوو کوو زانی چاوەکی کوێرەیە؟ گۆتی لە جێیەکی لەوەڕابوو لای چاوی ساغی گیای لەسەر ڕێچکان هینابووە دەرێ لای چاوی کوێرەش سەرە ڕنەکی دابوێ و هەندەی نەخواردبوو،پاشای گۆتە ساحێب حوشترێ هەڕوە دوو حوشترێ خۆ ئەوانە وەلینە هەموو شتەکی ئەزانن ،ئەویش ڕۆیشت ،مانەوە سێ برایەکان پاشای شەرم بەخۆ بوو وەیان برێتێ شرعی نگۆ چیە چ نیە، بانگی شوانی کردو گۆتی هەڕوە کن شوانی کیهە بەردیلی قەرەوە بیهینەوەو بیکوژەوە ،پاشای چ گۆ خورامی وەکرد وەختی نان خواردنێ داهات پاشای گۆت ئەمن ئەچمەوە لای ماڕێ ئەنگۆ شەرمێ مەکەن نانی لۆخۆ بخۆن ، وەشی گۆتە خورامی خۆ لە پەنای دەرکێ کڕکە هەرچ قسەکیان کرد وەرە وەمبرێ ، خورامی گۆ باشە دەستیان بەنان خواردنێ کرد، لەسەر نان خواردنێ براگەورەی گۆت ئەو گۆشتە گۆشتی کسۆکیە پاشای لۆمە کوشتیتۆوە،برای ناوەنجی گۆت جا ئەوە چیە ئەو ژنەی ئەو نانەی کردیە بێ نوێژ

بووە،برا گچکەش گۆت وەڵا دەنا پاشاشی بیژیە لە باوی خۆ نیە خورامیش ئەوا گوێ دایتێ،پاشی نان خواردنێ نانیان هەرگرت و پاشای بانگی خورامی کرد گۆتی چیانگۆ،خورامی پێ شەرم بوو گۆتی هیچیان نەگۆ پاشای گۆ وەڵهی قسێ نەکەی ئەتکوژم خورامی لەترسان قسە لۆ پاشای کردو گۆتی ئێکی گۆت ئەو گۆشتە گۆشتی کسۆکیە ئیدی گۆت ئەو ژنەی ئەو نانەی حازر کردیە بێ نوێژ بووە ئیدیکە گۆ پاشای بیژیەو لە باوی خۆ نیە، پاشا زۆر بە قسێ بیژیێ خۆ تێك چوو، هەرستا ناردیە دوو شوانی گۆتی شەوێدیم لە خەونێ دی وەمزانی ئەو بەردیلەی ئەتوو کوشتەوە کسۆك بوو ، شوانی گۆ وەڵاهی پاشا چت لێ وەشێرمۆوە وەختی خۆی وەکی ئەو بەردیلە بوو داکی مرداربۆوە دێرەکەك لەوێ بوو ئەو بەردیلە ئەو دێرەکەی ئەمێژی هەتا گەورەبوو ، پاشای گۆ بەقورئان مادام ئەوە وەبوو دیارە ئەمنیش بیژیمە ،هەرستا بەخۆ چووە ناو ژنان گۆتی کێ نانی ئەورۆ کردیە گۆتیان ئەو ژناهێ ،چوو وەیگۆتێ ئەتوو بێ نوێژی ؟ گۆتی ئەرێوەڵڵا پاشا ئەوە سێ ڕۆژە بێ نوێژم یەك نوێژم نەکردیە ،پاشای بەتەواوی بڕوا کرد کە بیژیە، پیرە داکەکی هەبوو هەندی خۆش ئەویا لەناو قەفەزێی کردبوو شیری دەست کردێ چووە کنی و وەیگۆتێ ، دایێ ئەوە چەند سارە ئەمن ئەتوو بەخێوەکەم یەك سوئالت لێکەم ئەگەر بەڕاستی جوابێم بدەیەوە عەفووت ئەکەم ئەگەر بەخەرەتی جوابێ بدەیەوە شەرت بی لەسەرت ئەدەم ، پاشای گۆتێ ئەمن لە باوی خۆمە یان بیژیمە ؟

داکێ گۆتیێ وەڵلاهـی کـورم چـت لێ وەشـێرم جـارەکێ بـاوت چـووە حـەجێ پیـاوەکن هاتـە کنـێ حـاجی بـوو ئـەمنیش بەتـەنێ بـووم تەعەددای لێکردم ئەتوو لەو کابرای ، داکێ خۆی عەفوو کرد چۆوە کن کـورە پاشـاکان وەیگـۆتنێ بەڕاسـتی ئەگـەر لـۆ شـرعێ هاتینـە شرعی نگـۆ بـەمن نـاکرێ ئـەمن مەلامـە بـەرا ئـەنگۆ وەلینـە ،ئەگـەر بەناوەکی دیش هاتینە کنەمن حەزێ کەن هـەتا دە سـاری دی لـەلام بن ئەمن خزمـەتکارم ئـەو پاشـایەی کیـژەك هـەبوو گۆتیـە خـورامی هەڕوو بڕێ باوی من ئەو شرعە ئەمن ئەتوانم بیکەم بەرا دەبـی هـەر ئێکیان لە هۆدەکێ بن نابی هێکـان ئاگـا لـە ئێگـدی بـی ،هەرسـتان هەر ئێکـی دە هۆدەکیـان کـردن کچـەکە هەرسـتا خـۆی ڕازانـدۆوەو خوانچـەکی پـڕی تـەعام و خـواردن کـرد و چـووە کـن بـرا گـەورەی لەدەرکەی چۆوە ژۆرێ گۆتیە برا گەورەی ها ئـەو خواردنـەی بخـۆ ، پاشی نان خواردنێ ئامێزی لۆ کردۆوە گۆتی وەرە کنم ئەمن لۆ تـوو نەمایمە ، برا گـەورەی گـۆ ئـەتوو خوشـکی منـی ئـەو شـتانە لەمـە ناوەشـێتەوە ئەمـە ئەمـەکی مـارێ بـاوی تـوون کردیـە کـوو شـتی ئەوهەئەکەم ، کیژەکە چۆوە دەرێ عەینەن بـەو میسـالی چـووە کـن برای ناوەنجی ئەویش وەیگـۆتیێ ئـەتوو خوشـکێ مـەی ئـەو شـتانە لەمە ناوەشێتەوە و ئەو شتانە ناکـەین ،لـەوێش هاتـە دەرێ چـووە کن برای گچکە هەردەرکەی کردەوە برا گچکەی ئـامێز لـۆ گرتـۆوەو گۆتی لەوەتی هاتیمە ئێرە ئەمن لۆتوو شێت بویمە ، کیژەکەش خـۆ هاویشتە ئـامێزێ بـرا گچـکەی کیژەکـەی کـردە ژن، سبەینە داهـات

گۆتیە پاشای کوڕی گچکە بارنجە و ئەوانی دی بابچنەوە تازە ئەمن ئێ برا گچکەیمە برا گەورەو برای ناوەنجی چوونەوە مارێ برا گچکەش لەلای مارێ پاشای بەجێماو کیژێ پاشای مارەکرد، ئەمنیش هاتمۆوەو چم پێ نەبرا.

---

احمد اسماعیل تەمەن ٧٥ساڵ

# میراتگری پاشا

هەبوو نەبوو کابرایەك و ژنەك هــەبوون لـە فـەقیریانیان دەرۆزاکـرد ، رۆژەکێ لە گوندەکی ئەچوونە گوندەکی دی لە رێیێ ژنەکەی دەست بە ژانان کرد میٚردی گۆ تۆ چیە گۆتی وەڵلا منـدارمابی ، وەختــەکی کورەکیان بوو گەلـەك کـەیف خۆشـبوون ئـێ لـەو جێیـەی نەشـتەك هەیـە تێـی وەرپێچـی و بیشـاریتەوە لەسـەرمایێ نـە ئـاگرەك هەیـە ،وەختەکی کابرای ئاورەك داوە ئاگرەك دیار بوو گـۆتی ئـەوا ئەچـمە دوو ئەو ئاگرەی داخوە هەندەك شتی نـاینم ، وەکـی چـوو پاشـایەك لەوێ بوو لە توجارییێ داتۆوە کابرای حارو مەسەلێ خۆ لـۆ گێـراوە ، پاشای گۆت بەسەرچاوان هەرستا دوو قات قوماش و فانیلەی دایـێ و ئاگریشـی دایـێ ،کـابرا گـەڕاوە ژنەکـە خـەنی بـوو جلکـی دەبـەر مەلۆتکـەی کـردن ، پاشـای وەزیـرەك هــەبوو لـەوێ قۆنـاغێ کـە قوماشی دا کابرای وەزیرەکەی خەونەك دیت سبەینێ گۆتیە پاشای ئەو منداڕەی دوونێ شەوێ هاتنـەکنت لـۆ جلکـان ئەبیتـە میراتـگری توو ،پاشای گۆت کورە دەبرۆ هەی مـارت خەرانـەهاتبی یـاخوە خـۆ ئەو منداڕە نە ئەیناسم نە ئەمناسی کووە بیتە میراتگری من،وەزیری

گو ئەوجا ئـەمن مـردی ئـەتوو زینـدی ،گۆتی دەباشـە مـادام ببیتـە میراتگری من ئـەمن لێناگـەڕێم ئـەلعان بـڕۆن هـەڕوون ئـەو منـدارەی هەرکوەکی هەبی بیکڕن و بیهیننە ئێـرە لێـرەی بکـوژن ،چـوونە کـن پیاوەکەو ژنەکەی گۆتیان پاشای ئەمە ناردینە ئەو مندارەو لێ بکڕین ژنەکەی دەست بە گریانێ کرد ، پیاوەکەی گۆت بـەرێوالله ئەیفرۆشـم انشاالله خـوا ئێکیـدین ئـەداتێ بـە چـەندیە دەی بـە چـەندی نـادەی گۆتی بە سەت لیرەی ، سەت لیرەیان دایـێ و بردیانـە کـن پاشـای ، پاشای گۆت وەکی ئـەمن ڕۆیشـتم بیکـوژن و جلکـێ بەخوینیشـم لـۆ بیـنن ،پاشـا بـەخۆ چـووە ئـەولای و خورامـانیش در نـەهات ئـەو مەلۆتکەی بکوژن ،هەرستان جلکیان لەبـەر کـردن و لـەبن دارەکیـان دانا بە ڕووتی ،چوون لەولای تەیرەکیان کوشت و جلکیان بـە خـوین کردن و لۆ پاشایان بردن ، پاشـاش گۆتـە وەزیـری خـەونێ تـوو درۆ بوو دەبا ببیتە میراتگرم،لەوێندەریان بـارکردو ڕۆیشـتن ، وەختـەکی پیرمێردو پیرەژن لەبەر عێدزیێ خـۆ بەوێنـدەردا تێپـەڕیوون گۆتیـە ژنێ جلکم لۆ کـوڕی خـۆ لێـرە هینـان ژنێشـی هـەر هـۆڕە هـۆڕ بـوو لەتاوێ کـوڕی وەختـەکی بەسـەر مەلۆتکـەی هـەریوون وەخـت بـوو لەخۆشیان شێت بن جلکیان دەبەر کردن و هەرستان لەترێ پاشـای لە گوندیان بارکرد و چوونە شارەکی لۆخۆیان دەرۆزاکرد ، مندارەکە گـەورەبوو، ڕۆژەکـێ پیرمێـردی وەگۆتـە ژنـێ گەلـەك لەمێـژە ئـەمن لەمەفتەنێ خۆ وەدوورکەتیمـە بابچینەوە ، وەڕێکـەتن هەرسێك لـە ڕێیـێ گەیشـتنە پاشـای ،خـورامێ پێشـانی دەگـەردا نـەمابوون

جەماعەتـەكی دیكـەی دەگـەڕدابوون گۆتیـە وەزیـری ئـەو كـوڕێهیٚ هەوبوو ئەوی ئـەمن كـڕیم دیارە نـەیان كوشـتیە، وەزیـری گـۆ خـوا ئەزانی داخوە ئەلعانیٚ چی لێهاتبی هەونیـە ،گۆتی بـەخوای هـەوە گۆتیە پیرەمێردی ئەو كوڕە ئی منە هـەق و مـاری تـووی پێـوە نیـە دەبـی وێشـم دەیـەوە ، پیرەمێـردیش گۆتـە كـوڕی ڕاسـتەكا كـوڕم وەختـی خـۆی ئـەمن ئـەتووم فرۆشـتبووە ئـەو پاشـایەی ئـەلعانیش دەبی دەگەری بچیەوە ، كوڕەكە دەگەر پاشای چوو پاشـای گـۆتیٚ كوڕم ئەمن ئەوا ئەچمە شامیٚ لۆ تیجـارەتییٚ ئـەوە هەسـپ سـواری بەو ئەو هەسپە ماریٚ مە پیٚ ئەزانی ئـەو كاغـەزەش بـدە كـوڕی مـن لەمارێیە ،كوڕەكە ناوی احمد بوو ، لە كاغەزی نوسـیبوو بـۆ كـوڕی خۆم هەردوو چاوەكانت ماچ دەكـەم ، وەختـی خـۆی خـەونیان بـەو كـوڕەی وەدیتیـە ئەبیتـە میراتگری مـن ئـەمنیش ئـەو كـوڕەم كڕیـە تكایە هەروەختی گەیشتە جیٚ سەری ببڕە باوكت /پاشا

احمد سواری هەسـپی بـوو چـووەماریٚ پاشـای وەكـی چـوو هەسـپی لەناو حەدیقەی بەستۆوەو هەند ماندی ببوو هەر هاتـە خـواریٚ پـاری داوەو خەوی لێكەت كاغەزیشی دەبەر سەری نـابوو، پاشـای كیـژەك هەبوو خویندەواری هـەبوو هاتـە دەریٚ گۆتی باشـە ئـەوە هەسـپی باوی منە ئـەوە لـۆ لـەناو حەدیقـەیان بەسـتیتەوە تەماشـەی كـردیٚ كوڕە جاحێرەك لـەویٚ خـەوی لێكەتیـە ،كیـژیٚ پاشـای هـەر چـاوی وێكەت عاشقی بوو ،چـووە سـەری كاغـەزەكی دەبـەر سـەری دابـوو

هینایە دەریێ وەکی خویندیەوە کاغەزی دڕاندو چوو قـەرەم و مـۆریێ باوی هینان،کاغەزەکی دیکەی نووسی ، بۆ کوڕی خۆم ئەوا ئەحمـد هات تکایـە هـەر وەختـەکی گەیشـتە جـیێ خوشـکێی لێ مـارە بکـە ، باوکت ... پاشا

کاغەزی دەبەر سەری ناوەو چۆوە ژۆریێ ، وەختەکی برای لە بـازاڕی هاتۆوە چۆوە ماریێ احمدیش لەخەویێ هەستا کوڕی پاشـای گـۆتیێ ئەتوو کی ؟ کـی نـی؟ گـۆتی ئـەمن احمـدم ئـەوەش کاغـەزی باوتـە ،خویندیـەوەو بـانگی خورامـانی کـردو گـۆتی هـەڕوون مـەلای بیـنن خوشکی لێ مارە کرد ،احمد بووە زاواو لەماریێ پاشای هۆدەکیان لـۆ ڕازاندۆوە ، چار سار پێچوون پاشا لە شامیێ گەڕاوە کوڕی احمـدی و کـوڕو کیـژیێ پاشـای وەدوو ڕاچـوون ، لـەولای شـاری کـوڕو کیـژیێ کوڕی پاشای گۆتیان ئەمـە ئـەویێ توینـە ئـەوەش کـوڕی کیـژێیتت ، پاشای گۆ بە قورعان قسیێ وەزیریە ئەو کوڕە ئەبیتە میراتگری من ، پاشا گەیشتەوە ماریێ ، احمدی گۆ بابچمە بـەخێر هاتنـەوێی ژنێـی گۆتیێ مەچوو ،احمدی گۆ دەنـا اتـوو هـەڕوو گـۆتی ناچـم هـەتا دە ڕۆژی دیش نێیە کنە من ،پاشای فکر کردۆوە گۆتی ئەوشەو ئەحمەد ئەچیتە کن کیژیێ من لەشەرمیێ منیش لە ماریێ خۆ ناشوا سبەینیێ ئەچیتە حـەمامیێ لـۆ خـۆ شوشـتنیێ ، خەبـەری لـۆ حەمامچـی نـارد هەرکەسـەکی سـبەینیێ زوو هاتـە حـەمامیێ یەکسـەر سـەری بـبڕە ،وەڕێککەت شەویێ کوڕی حەقیقی خۆی چـووە کـن ژنـیێ شەرمیشـی

کرد لەبەر باوی چونکه تازه لەسەفەرێ هاتبۆوه شەرمی کرد لەماریێ خۆ بشوا دەگەر بەیانی چووه حەمامێ دەرکێ حەمامێی کردەوه حەمامچی شیرەکی لێداو کوشتی ،خەبەر لۆ پاشای چۆوه گۆتیان کورت لە حەمامێ کوژرایه ،بانگی حەمامچی کردو گۆتی کوره قەحپه بابی سەگ باب لۆچت کوری من کوشت ؟ حەمامچی گۆت پاشا ئەدی ئەتوو بەخۆت خەبەر نەناردبوو هەرچی هات بیکوژه ،پاشای هەند خەفەت لە احمدی خواردن لە خەفەتان مرد ،احمد لە جێی وی دانیشت و بووه میراتگری ،داك و باوێ خۆشی هینانە کنەخۆو گەلەکیان بەخۆشی رابارد.

---

احمد اسماعیل

# پووش فرۆش

هـەبوو نـەبوو، کابرایـەك هـەبوو، لۆخـۆی پووشەفرۆشـت، سـبەینان وەکـی نانیـە خـوارد، دەئەچـووە چیاو دەشـتان، پشـتیە پووشـەکی دیناو لەبازاڕیە فرۆشت و بەسێ نانیە دان، ئێك لۆخۆ ئێك لۆ داکـێ و ئێکیش لۆ ژنێی.

ژنی هەندە تەمبەرو تەوەزەل بوو، تاقەتی نەبوو لەو بەری تەندووریٚ بچیتە ئەو بەری تەنـدووریٚ،گۆتیان رۆژەکێـی غـیرەت وەبـەرەخۆدا، لـەو بـەری تەنـدووریٚ چـووە ئەوبـەری تەنـدووریٚ، گۆتیـان وەیەگۆ(بەشەر تـەیری بێبـارە).هەرچـی ئیشـە ئـەویٚ ژنـیٚ نـاکردن، پیرە داکەکە غەریبۆکەی هەبوو، ئەویٚ نان عـازرەکرد،ژنێش دەسـت دەچۆکان وەردینا،پووش فرۆش ژیانی دەعەزاب دابوو، کەس نـەبوو بناوانی بی.لۆییٚ دەژیانەکی کۆرە مەرگیدا ئەژیان.

ماریٚ پاشای ئەو شارەش ماریـان لەتەنیشـت مـاریٚ پـووش فرۆشـی بوو،پاشای کیژەکە زۆر جوان و پێش چاو و زیـرەك هـەبوو،زۆرە بـە دیقـەت بـوو.رۆژەکیٚ چـووە کـن پاشـای،گۆتیە بـاوی خـۆ: پاشـام خۆشبی، ئەتوو فکریٚ خۆت دایتە ژیانی ئـەو پـووش فرۆشـەی؟بزانە

هـەموو رۆژێ ئـەو پیـاوە بەسـتەزمانە، ئەچـیتە دەشـت و دەران، بەپشتێ خۆ پشتیە پووشـەکێ دینـی و بـە سێنان ئەفرۆشـی ،ئـەو پیاوە کاسبە کەسەکی وەی نیـە بنـەوانی بـی، ئەگـەر ژنەکـە باشـی هەبایە،ئـەو پیـاوە دەسـتی زێـرە، بـەرا چ بنـەوانی نینـە.ئـەوان بـە پشـتیە پووشـانەژن، ئەمـەش هـەر ئـەژین، بەراسـتی زەلامـەکی رەشیدە، ئەگەر بێت ژنەکە مارداریکەری لەمارێ بـی و سـەراڤەتیێ ئەوێ مارێ بکات ،ئەوا ژیانیە گۆڕێ،ئەو پـووش فرۆشـە هـەر ئیوهـە نـابی و ئەبیتـە پیـاوەکی گەورە،چـونکە لەمێـژە گۆتیتیـان (کـار هەردەبن سەواندا نابن).مادام ئەو پیاوە بتوانی بەزەبرێ مـلان نـانی پەیدا بکات،ئەوا دیارە پیاوەکی رەشیدە.

پاشای گۆت: کیژم وەنیە

ئەگـەر پیـاو پیـاو بی،شـەرتی ژن نیـە،وەکی پیـاو چـی لەدەسـت نیێ،ژن باهەر لەمارێ بی سەراڤەتییێ بکات،چ فایدەی هەیە؟

کیژێ گۆت:گەورەم ئەتوو ئەمن بنێرە کن ئەو پووش فرۆشەی،ئەگەر نەمکردە مارو خانـەدان و خـانیم لەقەسـرێ تـوو برنـدتر نەکرد،ئـەوا لەوە سیەت و مارو میراتی بارنجم کە، یان لەسەرم دە،ئەگـەر وەکـی گۆتیشم وەم کرد، هەرچی گۆتم دەبی لۆم جێبـەجێ بکـەی، پاشـای گۆت باشـە ئـەمن لەسـەر وەعـدێ خۆمـەو هەرئیسـتەرەم هـەرەوەکن پووش فرۆشی یزانم چت لەدەست دێ.لەسەر بانی قەسرێ رێك کەتن

و خانمێ مارە باو بەجێ هێشت وقالبە زێڕەكی دەگەخۆ بـردو خـۆی خزاندە مارێ پووش فرۆشی.

هێوارێ پووش فرۆش چۆ مارێ، دیتی كیژەكە جوان و رێك و پێك ئـا لـەمارێ وانـە، ئـەویش بەخێرهاتنەكـە گـەرمی لێكـرد و وەیگـۆتێ خوشـكێ ئـۆ چـەكەی لـەمارێ مـە؟كووە هاتیـە ئێرە؟چیشـەكت هێیە؟.خانمێش وەگۆ:ناوەللاّ بـرا ئـەمن بـەناوی خوشك و برایـەتیێ هاتیمـــە مـــارێ نكۆ،ئـــەموێ مـــاوەكی لـــەمارێنكۆ بم،ئەگـــەر قبوورکەی،ئەویش گۆ: لـۆ قبـووری ناكـەم، مێـوان عـەزیزێ خوابـە، ئەتوو خوشك، ئەمنیش برا، وەرێك كەتن.

ماوەكی مانەوە،رۆژەكێ خانمێ وەگۆ: برا خـۆ نـاكرێ هـەتا هـەتایێ ئەتوو هەر پووش فرۆش بی،هابگرە ئەو قالبە زێڕەی هـەڕوە بـازاڕی ئیشـەكی پێبكـە،ژیانی خـۆ بگـۆڕە، پـێم خـۆش نیە،هـەر خـەریكی پووش فرۆشتنێ ببی،پووش فرۆش هەرستا قالبە زێـڕی دەسـتكردێ و چووە بازاڕی.

لەناو بازاڕی زەینێ خۆی داێ دیتی كابرایەكی هاوارەكرد،ئەیگۆ:كی بی هەندەك پارەم بداتێ،هەتا لەوەختی تەنگاییێ بەهاناوەبێم؟

پووش فرۆش قالبە زێڕی داێ و هاتۆ مارێ،خانمێ لێپرسی:ئەدی كا خواردنەك؟ئەشـتەكت لـۆ لۆمـارێ نەینایە؟ئـەویش گـۆ: كابراایـەكی لـەبازاڕی هـاوارەكرد ئـەیگۆ:كـی بـی هەنـدەك پـارەم بـداتێ هـەتا

لــەوەختی تــەنگاوییێ بــەهاناوە بێم؟ئــەمیش قالبــە زێڕەکــە داوی.خانمیٚ گۆ چاك چاکت کرد.

سبەینیٚ بەو میسالی هەرستا چۆ بازاڕی هەتا ئیشـەکی پەیدا بکـات، کاروانەکی تاجیرەکی زەنگین بەوێدا هـات، گۆتیانـە پـووش فرۆشـی لۆنـاییێ دەگەرەمـــە بێـــی فێـــرە کاروانچـیەتی و تیجارەتیێـت بکەین؟گۆتی ما لۆ نابێم،بەس راوەستێ با بەمارێش برێم،چۆ ماریٚ و وەیکۆتە ماریٚ ئەمن دەگەر ئەو تاجیرەی ئەچمە کاروانی،خانمیٚ گۆ هەڕو بەس ئاگات لەخۆ بـی فێـرت لێنـەکرێن.چـوو سەرەکیشـی لـەو کابرایەی دائەوی قالبە زێڕی دابویٚ، کابرای وەگۆ: ئەگـەر دنیـا بـوو لێیان پرسی (چ لەدنیایٚ لەهەموو شتی خۆشترە) بریٚ (دوو در ئێـك بن).

پووش فرۆشی خوا حافیزی کردو وەگەر قافریٚ کاروان کەران کەت و رۆیشتن،هەر رۆیشـتێ وەختـەکی گەیشـتنە سـەحرایەکی ،ئاویشـیان وێنەبوو،تێنی بوون، وراغانیش حەڕەکە لێبڕا لـەتێنان،بانگی پـووش فرۆشیان کردو گۆتیان دەبـی بچیە نـاو بـیریٚ ئـاوێن لـۆ هەرکێشـی، دۆلکەیان لێقەیم کردن و شۆڕیان کردۆ ناو بیریٚ، هـەتا هـەموو تێـراو بوون و وراغاتیش تێر ئاو خواردۆ،ئێجا پەتکیان بەرداو هەریان دا ناو بیریٚ،هەرچـەندی هـاواری کرد،بێفایـدەبوو، وەختـەکی لـەناو بـیریٚ دەرکەکی لێبوو، ئەویش لەدەرکیٚ دا، کابرایەك و ژنەك هاتنە دەریٚ، گۆتیـان ئـۆ چـەکەی لێـرە؟ ئـەویش حـارو مەسـەلیٚ خـۆ لـۆ گێڕانـۆ،

پووش فرۆشی گۆ ئەدی ئەنگۆ لێرە چەكەن؟گۆتیان ئەمە هەر لە ئیجادەوە لێرەینەو ئەگەر بتوێ بچیۆ سەر دنیایێ، ئەها تەماشەكە ئەوێ قەسرێ بینی هەمووبەسەركێ بەشەرانا دروست كرایە،جێی ئێك سەركی مایە،لەوانەیە جێی سەركی تو بی،ئێك پرسیارن هێیە ئەگەر زانیت ئەوا بەماری دنیاییێت خەنیەكەین،ئەگەر نەشت زانی هاها ئەبینی جێی ئێك سەركیا مایە.

پووش فرۆشی گۆت:منەتو نەبی پرسیاریێ خۆ بكەن.

گۆتیان: لەدنیایێ چ شتەك لەهەموو شتەكی خۆشترە.؟

پووش فرۆشیش گۆ: دوو در ئێك بن لەهەموو شتەكی خۆشترە.

گۆتیان تەواوە، جوابەكی پرپە پیستیەو چەند سارە ئەمە لێرە ئەوە ئیشیتن، ها بگرە ئەو سێ هەنارانە بگرەو ئاگات لێبن،ئەو هەنارانە (دوڕپو گەوهەرن) قیمەتیان زۆرە، پوش فرۆشی گۆت ئەدی كو بچمۆ سە دنیایێ ؟ گۆتیان كاروان چی زۆر دێنەسەر بیرێ، هەر قافرەك هات خۆ بە دەولكەی وەكەو بەری مەدە هەتا ئەچیۆ سەرێ، ئەوان لەو قسانەدابوون كاروانەك هاتنە سەر بیرێ و دەولكیان شۆڕكردۆو پووش فرۆشی خۆپێوەكرد، هەریان كێشا هەركووەكی هەبوو چۆوە سەرێ، كاروان چیان گۆ ئەتوو چی؟گۆتی كاكە وەڵلآ ئەمنیش وەكی نگۆ بەشەرم،وەسەر دنیایێ كەتۆو، گۆتیە كاروان چیان كێواچن ؟دیار بوو ئەگەڕانۆ وراتی پووش فرۆشی،گۆتی خێروەگاتێ ئەو ئەمانەتەو وێدەم لۆم بگەینۆ مارێ، گۆتیان باشە بیهینە، هەرستا

دوو هەناری دەناو پەڕۆکەکی ناو ناردیۆ، بەخۆش چووە ناو شارەکی ،گۆتی دەبا بزانم داخوە ئەو هەنارە چیە دایتیانە من، شکاندی تەماشەی کردیێ، چ دنکە هەناری تێدا نینە، هەمووی پارچە پارچەبوون، هەمووی فرەدان، ئێك دوو دنکی وێمابوون، بەپێش زێڕینگرەکیدا تێپەڕی، زێڕینگری بانگ کردیێ:کوڕە کاکە ئەو دوڕڕو گەوهەرانە لۆ فرادەی؟پووش فرۆشی وەگۆلۆ مائەوانە دوڕڕو گەوهەرن؟ گۆتی ئەدی، گۆتی چەندیە کەن؟زێڕینگری گۆ: ئێك قافرە لە زێڕو زیوی لۆت بارەکەم.

پووش فرۆش بە قافرەکی زێڕو زیوی گەڕاوە جێی خۆی، چۆماریێ خۆ ،وەکی چوو ژنێی دەست دەچۆکان وەریناپەو لەدەورەی تەندووریێ، هەلە جێی خۆیە،

کیژی پاشای ئاگا لێبوو،وەدووی راچوو، گۆتی وەرە ئێرە ماریێ تووە،

قەسرەکی دروست کردبوو، هەر لگبنەك لە زێڕی ئێك لە زیوی، دوو هەندی قەسریێ پاشای، قاتەك و کراسەك و پێراوەکی نوێی لۆ کڕیبوو، هەستا جلکی پێکڕین و بانگی رایێشت لەدوو ئەهلی شاری ناردو مەلاو ردێن سپی هەموو بانگکردن، پاشاش دەعوەت کرا، خواردنیان رێزکرد، قاپ هەموویان لە زێڕی بوون، لەوەختی نانخواردنیێ پاشای قاپەك بەدزی هەردا باغەریێ.

گیژێ بانگ کردێ گۆتی: پاشام ، گەورەم، نۆیاو، عەیبە قاپان مەدزە ، دوابێت زۆرانەدەمێ.

پاشای گۆ: مەلا ناوێ خوای لێبینە تازە ئەوێ کیژێ کەلکێ چ مارێ من نەمایە،هەستە لێی مارەکە،

ئیدی جار درا،کیژێ پاشایان لە پووش فرۆشی مارەکردو چوون ژنێ قەدیمیشیان دەگەر داکێ هینانە قەسرێ، بەخۆشی ژین.

ئەمنی ش بەس ماندیەتی لۆ ماوەو هیچیان نەدامێ.

ئەو حەکایەتە بەڕێز خار محمەدی مەلا رەسووری تووتمێ لۆ گێڕامۆ/لەژیاندایەو تەمەنی ٧٥ ساڵە.نەخوێندەوارە.

# سێ کۆسە

هەبوو نەبوو کەس لەخوای گەورەتر نەبوو کەس لە پێغەمبەری ڕاستگۆتر نەبوو کەس لە عەبدی درۆزن ترو ڕوو ڕەش تر نەبوو ، ئەیانگۆ سێ کۆسە هەبوون،کۆسەش ئە بەد عەمەلن و سڕیاتێ ئێکدیە زانن،دوو کۆسە لە گوندەکی بوون ئەوی دیش بەتەنێ لە گوندەکی دی بوو ،ئی بەتەنێ بوو مەڕەکە قەرەوی هەبوو لەناو مێگەلە مەڕێدا دیاربوو ، هێوارەکی دوو کۆسە ئەگەڕانۆ گوندی دیتیان مەڕەکی زۆر قەرەو دەناو مێگەلە مەڕێدا دیارە و لەشوانیان پرسی ئۆ ئەو مەڕە ئی کێیە ،شوانیش گۆ ئێ کۆسەیە ،کۆسەکان دەستەکیان لە پشتێ مەڕەکەی داو گۆتیان بەخوای گۆشتی تێدایە ،هێوارە داهات مەڕ چۆوە گوندی ،کۆسەی بەتەنێ تەماشەی مەڕێی کرد زانی دەستی لێدرایە ،گۆتیە شوانی ئۆ کێ دەست لە پشتێ مەڕی من دایە،شوانیش گۆت هەردوو کۆسێ برادەرت ،کۆسەی گۆتە ژنێ تازە ئەمە زەحمەتە خێرێ لەو مەڕەی ببینین ،وە چاکە بەو شەوەی مەڕی بکوژینۆ ،هەر بەوە شەوەی مەڕیان کوشتۆوە هوردیان کردو گۆشتیان دەناو پیستی ناو بەهەوایان وەکرد و وەبن

سەراپیتانیان وەکرد و لێ نوستن،شەو ڕاشکاو هەردوو کۆسە گەیشتنە پێش ماڕێ کۆسەی بەتەنێ ،تەماشەیان کرد کۆسە بەخۆو بەژنێ ئا لێکەتیتە خەوێ ، ئێکەك لە کۆسەکان چوو لەبەینی کۆسەو ژنێی دریژ بوو نەقورچکەکی لە ژنێ کۆسەی داو گۆتی گۆشتت لە جێیەکی چاك دانابی نەکە کۆسە بێن بدزن ، ژنەکەش ئەچاو بەخەوبوو گۆتی ئەدی ئەتوو بەخۆت بەبن سەراپیتان وەنەکرد ؟ کۆسەش گۆتێ باشە باش هەردوو کۆسان گۆشت دیتۆو بردیان ،سەروەختەکی ژنەکە وەخەبەر هات گۆتی باشە ئەدی هێوارێ مێردی من بەخۆ گۆشت بەهەوای وەنەکرد لۆ ئەو پرسیارەی لێکردم؟ بانگی مێردی کرد گۆتی باشە ئەدی ئەتوو هێوارێ بەخۆ گۆشت بەهەوای وەنەکرد ؟ لۆچت ئەمن لەخەوێ هەستاندم؟ کۆسەی گۆ کچێ وەڵلا ئەمن نەبویمە ، تەماشەیان کردێ گۆشت نەمایەو بردیتیان،کۆسەی خۆ قەیم کردۆو وەدوویان ڕاچوو، لەبەرئەوەی گۆشتەکە زۆربوو ،ئێکەك لە کۆسەکان گۆشتی هەرەگرت و ئەویدیش لە پێشی دا ماوەکی ئەڕۆیشت و لە جێیەکی چاوەڕێیەکرد، کۆسەی بەتەنێ چوو لەبەینی هەردووکان لێ دانیشت و وەختەکی ئێك لە کۆسەکان (قنەقنی) گرتبۆوە لەماندیەتیان، کۆسەی بەتەنێ گۆتی کا بینە وەمنی دە ئیوەهەت هەناسە لێ هەرمایە، سەروەختەکی هەردوو کۆسە گەیشتنۆ کن ئێکدی بەبێ گۆشتی ، ئەوی گۆ کا گۆشت ئەوی دی واگۆ کاگۆشت؟ پێی ئەوەی کۆسەی بەتەنێ بگاتۆ ماڕێ ئێکەك لە کۆسەکان جلکێ ژنانی دەبەر

کردن و لە پێش ماریێ کۆسەی بەتەنێ دانیشت ، کۆسە گەیشتەوە وێندەرێ و گۆتی ئۆ لۆ بەو شەوەی لێرە دانیشتی ژنێ؟ ئەویش گۆ هەتا ئەتوو بەدو گۆشتی داچووی چێرو گۆلك و کەر بەرەڵلا بوون و چوونە ناو باخچان، کۆسەی گۆ کا بگرە گۆشتی هەتا بەدوو چێرو گۆلکان دا بچم،کۆسەی گۆشت بردو ڕۆیشت، کۆسەی بەتەنێش هەموو باخچە لێکداتۆ چ چێرو گۆلك و کەری لەناو باخچان دا نەدیتن ،هاتۆ ماریێ تەماشەی کردێ چێرو گۆلك و کەر هەرا لەمارێنەو ژنیشی لە پرخەی خەوێ دایە یەك دوو پێلەقەی لە ژنێ دان و پرچی ڕاکێشا گۆتیە ژنێ بەشەوەت ئەمن وەناو باخچان هێخستم ،چێرو گۆلك و کەریش هەرا لەمارێنە،ژنەکەی دایە سوندو قورعانان وەڵلا ئاگام لەو سەین و بەینەی نەبووە، ناعیلاج بوو کۆسەی بەتەنێ وەدوو گۆشتی دا وەڕێ کەتۆ ، وەکی چوو ئەوان گەیشتبونۆ گوندی خۆ ، ئێکەکی گۆشت لەپێشە خۆ دانابوو لەپێش مزگەفتێ ، ئەویدیش چووبو تەرازوێ بینی هەتا گۆشتی پێ وەبەشنۆ ،کۆسەی بەتەنێ چووە کن ئی لەکن گۆشتیەو گۆتی وەڵلاهی پسسام تەرازووم پێ پەیا نەبوو، کۆسەی گۆت وەرە دانیشە تابچم تەرازوێ پەیا بکەم ، کۆسەی بەتەنێ گۆشتی بردۆوەو ئەوانی دیش وەختەکی هەردووك گەیشتنۆ پێش مزگەفتێ و هەردووکانیش تەرازوو وێبوو، ئەدی کا گۆشت ؟ ئەدی کا گۆشت؟ هەردووك چوونەوە پێش ماریێ کۆسەی بەتەنێ تەماشەیان کرد ەبەخۆو بەژنێ گۆشتیان لە

پێشەخۆ دانایە و بانگی هەردوو کۆسانیان کرد گۆتیان بەبێنگۆن پێناخوریێ وەرنەژۆریێ ، ئیدی پێکەوە گۆشتەکەیان خوارد.

# حەسەنە شوڕە

هەبوو نەبوو کابرایەك هەبوو ناوی حەسەن بوو  هەندی ترسەنۆك بوو کوێشکە بە عاسمانێ دا فڕیبایە ئەوی خۆ بە عاردی دادا لۆیێ وەیانە گۆتێ حەسەنە شوڕە، ڕۆژەکێ دەگەر خورامەکی ماریً پاشای بەدمەقار هاتن و چینەکی چاکی وێکەت ،

لۆیێ گۆتیە ژنێ حورمێ تازە ئەمن لێرە حاوانەوەم نەما دەبی لۆخۆ سەری خۆ هەرگرم و بچمە لایەکی دی وەڕێکەت چووە شارەکی دی و چووە مارێ پاشای  حەڕەسان تێوەڕاخوڕی و گۆتیان کێوا چی ؟ گۆتی ئەمن دەگەر مارێ پاشای  وراتێ خۆم لێ قەومایە کوشتارەکی زۆرم لێکردینە ،خەبەریان دا پاشای حار لەوەی حیساب لەوەی ،پاشاش لەبەر ئەوەی عەداوەتی دەگەر پاشای ئەو وراتەی حەسەنە شورەی هەبوو لۆیێ زۆری بەخێرهیناو گۆتی لەلای من بمینێوە ،حەسەنە شوڕەش بەحسی ئازایەتیێ خۆ لۆ پاشای ئەکرد، لەو وەختی دا پاشای بانگی خورامان کردو خانیەکی باشیان لۆ حازر کردو چوونە دوو مارێ حەسەنە شوڕەی ، ماریان لۆ هیناو ماری دامەزراندو هەموو ڕۆژێ ئەچووە دیوەخانێ پاشای، ڕۆژەکێ

لەتەنیشت كۆشكێ دەگەر پاشای دانیشت بوون، خورامەكی پاشای بەهانە هان هاتە كۆشكێ و گۆتیە پاشای ، پاشام خۆشبی خەبەرەكە نەخۆشم وێیە ، پاشای گۆت چ خەبەرە؟ خورامی وەگۆ پاشام خۆش بی دەعبایەك پەیدابووە لەو دەشتەی هەرچی بیگاتێ ئەیكوژی ، پاشا تەماشەكی حەسەنە شورەی كردو گۆتی مادام حەسەناغەن هەبی دەعبا چیە، حەسەنیش هەرستا بەغاردان چۆوە مارێ گۆتیە ژنێ ئێجا چم لێكەی؟ ئەرێن دەعبایەك پەیدابووە كەسی نێشتیە، پاشاش ئەرێ مادام حەسەناغەن هەبی دەعبا چیە، ژنێش زۆر در داوەو گۆتی ئێجا چیە ؟ئەتووش سبەینێ دەگەر عالەمێ هەروو ئەوان چكرد ئەتووش وەبكە،

ئیدی سبەینە داهات عالەم وەرێكەتن ، هەسپەكیان لۆ حەسەنە شورەی هیناو سواربوو گەیشتنە دەشتێ و دەعبایان دیتۆ ، تەماشەیان كردێ دەعبایەكی گەورە سەری لەدوو خەركی ناو كەتە دوو هەسپێ حەسەنە شورەی ،هەر لێرە هەر لەوێ حەسەن لەهەسپی كەتە خوارێ و دەعبایا لەدووە ،حەسەنیش لەترسان وەسەر ئەسپیندارەكێ هەریەزی و دەعباش سودفە لەبن دار ئەسپینداری كەت ،حەسەنیش هەر لەرزی و لەرزی لەترسان كەتە خوارێ و كەتە سەر پشتێ دەعبای و لەترسێ خۆ هەردوو گوێیێ دەعبای گرتن، لەشكری پاشای هەموو عەجایب مان و ئەیانگۆ تەماشەكەن حەسەناغەی كوو دەعبا بەگوێیان گرتیە ،دەعباش

هەندی لەولای لۆ ئەولای غاردا وەختەکی کەت ، ئیدی گەیشتنە سەری و بە ڕم و شیرانیان دەعبا کوشت و حەسەناغەیان سواری هەسپی کردۆوەو بردیانۆ کۆشکێ،پاشای نیوچەوان ماچ کرد و گۆتی بەڕاستی مەردو ئازای ،خزمەتەکی باشی حەسەنیان کردو پاشای ئەمر کرد گۆتی دەبی ئەو دەعبایەی دە کاییدا هەریاخنن، بیکەنە هەیکەلەك و لەپێش کۆشکێی دابنێن ، حەسەناغەش وەکو نانا پاشا هەرچەندە بەخۆما گرتیەو کوشتیتم بەرا کەیفم بە جەهری نایێ ، مەزانە هێشتاش لێیە ترسا،

چەند ڕۆژان حەسەناغە دەنازو نیعمەتان دابوو ،هەر ڕۆژێ ناوبانگی زیاتر براو ئەبۆوە کە دەعبایەکی بە گوێیان گرتیە ، ڕۆژەکێ لە پێش قەسرێ دەگەر پاشای دانیشت بوو لەناکاو ڕا خورامەکی پاشای بەهەناسە برکێ هات و گۆتی پاشام خۆش بی دەعبایەکی دی پەیدابووە عالەمی نێشت،هەرچی بیگاتێ ئەیخوا، پاشاش تەماشەکی حەساناغەی کردو گۆتی ئەجا چیە ئەلعان حەسەناغە ئەچی سواری سەر ملیەبی و بە گوێیانیە گری ، حەسەنی ڕەنگ تێکچوو ، بە غاردان چۆوە مارێ گۆتیە ژنێ بن کانتۆرێم لۆ قۆرکە ،جارێ دی دەعبا هاتە بن سپینداری و ئەمن کەتمە سەری و ئەمنیش لەترسێ خۆ گوێگرتن و کوشتیان ، بەرا ئەوێ جارێ چ بکەم ؟

ژنێ وەگۆتێ حەسەن ترسی ناوێ ،ئەتووش وەکی عالەمێ هەروو خۆشەرت نیە ئەتوو بیکوژی ، ئیدی لەخەمانی لەبن کانتۆرێ خەو لێکەت،شەو داهات وەختەکی ژنێ حەسەنی چووە پێش دەرکێ ، تەماشەی کردێ دەعبا ئەوە لە پێش مارێ وانە، هەرزوو تیروکەوانی حەسەنی هینان و تیرەکی گرتێ و دەعبا بەریۆوەو تۆپی ،ژنەکە هەستا چوو پشتێنێ حەسەنی هیناو دەملی دەعبای کردو لە پێش دەرکێی بەستۆوە ،سبەینێ پاشای خورامەك ناردە کن مارێ حەسەناغەی لۆ هەندێ کە بچن بەدوو دە عبای دا ،خورامی تەماشەکردێ ئەوا دەعبایا کوژرایەو بەسترایتۆوە لە پێش مارێ حەسەناغەی ، خورام بە غاردان گەڕاوە قەسرێ ،وەیگۆتە پاشای حار لەوەی حیساب لەوەی ، پاشا بەخۆ چوو تەماشەی کردێ زۆری پێ عەجایب بوو ، لەولاش ژنێ بانگ کردە حەسەنی و وەیگۆتێ هەستە شەوێدی دەعباما کوشتیە و لە پێش دەرکێما بەستیتەوە ، ئیدی بووە شایی و گۆڤەند حەفت شەوو حەفت ڕۆژان داوەت بوو ، حەسەناغەش زیاتر گەورەبوو لەکن پاشای ،

ڕۆژەکێ هەر وەکی جاران لەپێش قەسرێ دانیشتبوون دەگەر پاشای ،کابرایەك هات و کاغەزەکی دا دەستی پاشای ، کاغەزەکە ئی پاشایەکی گەورەتر بوو ، تێیدا نوسرابوو خەرجێ حەفت سارانت لەسەرە دەبی زوو بدەی ،پاشای ڕاست جواب گۆتیە کابرای با پاشات گووی بخوا مادام حەسەناغەم هەبی ،چ باکم بەشەڕیە،

حەسەناغەی غاردارەو ماریَ و گۆتیە ژنیَ زیاترم بن کانتۆریَ لۆ قۆرکە جاریَ ئێکەم دەعبا هاتە بن ئەسپینداریَ و ئەمنیش کەتمە سەری ، جاریَ دووەم ئەتوو کوشتت ،بەرا ئەویَ جاریَ چ بکەم ؟ ئەوە شەڕە چەندی ژنیَ در داوە بەرا فایدەی نەبوو،حەسەنی بەستەزمان لەبن کانتۆریَ حەیات لێبڕاو مرد.

---

ئەو حەکایەتە کاك جبار حمد قادر خەڵکی هیران بۆی گێڕامەوە /تەمەن (٥٥) ساڵ / خوێندەوار

## سەرکە مەڕ

هـەبوو نـەبوو،جۆتیارەك هـەبوو،ماوەك بـوو وەکـی ئەگەیشتە سـەر جۆتی،پێشی دەسـت بـە جـۆتی بکا،دەنگـەك دەهـات ئـەیگۆت مـام جۆتیار وەرە لۆخۆم ببـۆوە،رۆژەك نـەبوو ،دوو نـەبوو، فکـری کـردۆ گۆتی دەبابچم بزانم ئەو دەنگە چیە؟

وەکـوو چـووە نـاو ئەشـکەفتیٚ، لێڕامـا سـەرکە مـەڕەك لـەویٚ کەتبوو،چاوی گێڕان کـەس دیـار نـەبوو،دەنگ لـەناو سـەرکە مـەڕی دەهات،هـەری گـرت و هاویشـتیە نـاو توورەکـەی و رۆیشـت چـۆوە ماریٚ،وەکی شـەو داهـات تەماشـەی کـردیٚ ،کـوڕەجحێرەکی جـوانی کوڕەپاشـایانی هاتەدەریٚ،ەبکـەی هەنـەخۆی بـەس تەماشـەی بکەی.لەتەماشەکردنێی تێرنابووی،کوڕەکەی گۆتە جۆتیاری :

ئۆباو،لـەوڕۆ بـەولاوە ئـەتوو بـاو و ئـەمنیش کوڕ،جۆتیـاری گـۆت ،دەباشە، لەوەی باشـتر،هەلەویٚ گـۆڕیٚ کوڕەکـت لـۆ پەیـدابی.ئـۆ نیعمەتیٚ خوایە،بێماندی بـوو نـو بـیٚ مشـەققەت.مـاوەکی ئەوهـەیان رابارد،وەکی ئێکەك دەهاتە مـاریٚ گـاوانی ،ئەچۆناو سـەرکەمەڕی و وەکی دیش لەدەریٚ بوو.

ڕۆژەکێ لە هیکرا کوڕچۆپێش باوی و گۆتی باوۆ،جۆتیاری گۆ:هاکوڕم چتە وێ؟گۆتی ئۆباو هەرکووەکی بی دەبی کیژێ پاشام لۆ بخوازی. جۆتیاری چەندی گۆتی داخوازیێ کیژێ پاشای لەقەوامێ مندا نیە،بێفایدەبوو،گۆتی هەردەبی لۆم بخوازی.

جۆتیاری بەستەزمان و بابان کۆر بەناعیلاجی هەستا چۆ پێش مارێ پاشای ،بەغەریبی خۆی بە دەرکێ عەوشێ دەرێ هەرپەسارد.پاشای چاو لێبوو،بانگی خورامانی کرد، گۆتی چیە دەرێی نان و نەدایتە جۆتیاری؟خورامان گۆ:پاشان خۆشبی سبەینێ زوون نانا دایتێ.

جۆتیاری گۆ وەڵڵاهی پاشا مادام هەرکوڕم بکوژی ،ئەتووم بکوژە باشترە،کوڕەکما هێیە ئەرێ ئیللاو بیللا دەبی کیژێ پاشام لۆ بخوازی،پاشای گۆت خورامینە بڕۆن ئەو قەحپەبابەی وەدوور بێخنۆو لەسەری دەن.

وەزیری دەستەراست گۆتی پاشا لەسەری مەدە، بەهانەکە وەی وەبەر هەرەکەین ، ئەگەر جێبەجێی کرد،ئۆ ئەی دەینێ، ئەگەر پێشی نەکرا هەنگینێی لەسەریەدەین.پاشا رازی بوو و گۆتی باشە.

بەهانەکەش ئەوەهەبوو،پاشای وەگۆت:هەرلە مارێمە هەتا مارێنگۆ،خانیەك بکرێ، هەر لگبنەك، ئێك لەزیوی، ئێك لە زێڕی،هەرلەمارێ مە هەتا مارێنگۆ،دۆشەك رابێخسترێن،هەموو

دۆشەکان هەوری پێدا درابن،کەرەبابەکی زێڕی لەسەر بی،هەبانگا بدات،

جۆتیار بە عێدزی چۆ ماریێ، هەرلەسەری خۆیەدا،گۆتی کورم تووشی ڕۆژە ڕەشیێ خۆ بووم، ئەو ئیشە کوو بەمنەکریێ؟پاشای ئەوهەگۆتیە، کوڕی گۆ : ئۆباو خەمان هەرمەکرە ، بمبە سەر رووباری، جۆتیاریش هەستا بردیە سەر رووباری.گوستیلەی هاویشتە رووباری ، چەند پەری هەنە وەسەر دنیایێ گەڕان،گۆتیان ها چتەویێ ئەحمەد؟گۆتی ئەمویێ ئەو شتانەم هەتا سبەینێ، هەرکووەکی هەبی دەبی جێبەجیێ بکەن،

تاسبەینە داهات خانیان برند کردو ئەوی گۆتبووی، هەمووی بەزیادەوە جێبەجیێ کران.

مەلای پاشای برند بوو تاسبەینە داهات، سێجاری بانگ دا، پاشای گۆتە مەلای :ماموەستا ئۆ چیە ئۆ سیێ جار بانگی بدەی؟خۆهێشتا نوێژ نەبووە.مەلای گۆت:ماریێ تووم کۆر بیتۆ،ما توو وەکردیە،بزانە جۆتیاری چ بیناو خانی لۆ کردی.؟

پاشای وەکی تەماشەی ئەو بەرو خانیانە کردن، تەحەیر ما، گۆتی ئەوجا بڕۆن برێنە جۆتیاری و کوڕی بابێن ، هەتا کیژێی بدەمی،هەر عەینی وەخت کیژیێ پاشایان لە کوڕی جۆتیاری مارەکردو هەر یەکسەریش لۆیان گواستۆ.وەکی شەو داهات سەرکە مەڕیان لەسەر

خوانچەکی لەپێش بووکێ دانا، پەشتە مارەکیان بەسەر دادا،بووکێ وەکی تەماشەکردێ وگۆتی : ئۆ چیە سەرو پێچکام پێچاکەکەن؟.

لەهیکڕا کوڕە جوانەکی لێهاتە دەرێ، هەنەکەی هەنەخۆی بەس تێی وەڕامینێی.هەندەی جوان بوو،هەتا شەو راشکا ، دەست گەمەو ماچ و موچ و رابواردنیان کرد،هەتا رۆژ هەرات، وەکی بووە رۆژ، ئەحمەد چۆ ناو سەرکە مەڕی و پەشتەماریان بەسەر هەرکێشاوۆ.

رۆژەکێ پاشای لەدوو ناردن، گۆتی پێم خۆشە زاوای ببینم و عەزێ کەم بێنە کنم و غەریبیێ کیژێشم کردیە.ئەحمەدی خەبەر لۆ پاشای نارد، گۆتی ئەمن ئیوهە نایێم،با دەستە جلکەکم لۆ بنێری ، دەگەر هەسپەکی و دوو زەلامان،پاشا دەستە جلکەکی پاشایانی لۆ ناردو هەسپەك و شیرەك و دوو زەلامی ناردن و ئەحمەدیان سوار کردو بردیانە کن پاشای،داکێ بوو کێ گۆ با ئەمنیش بچمە کن کیژاخۆ، بزانم چەکات، وەزعی کووە؟کیژێ گۆت وەڵلاّ دایێ عەیبێ نینە،بەرا ئەو سەرکە مەڕەی ئیشی ما تێك دایە،ئەچیتە ناو ئەو سەرکە مەڕەی لێناگەڕێ کەسی ببینی.داکێ گۆتە کیژێ، کیژا من بینە با ئەو سەرکە مەڕەی لێبسۆتینین، کیژێ گۆ دایێ نایسۆتینین ، ئۆ لە دێوانە بۆنێکا، داکێ گۆ نانا کیژم بۆنێ ناکا،سێریان لەسەر ئاگردانێ داناو سەرکە مەڕیان هاویتە ئاگری و سۆتاندیان.

ئەحمەد لەماریێ پاشای بۆن کردو هەرستا هاتۆ ماریێ، گۆتی دایێ چت کرد، گۆتی کوڕم چم نەکردیە، ئەحمەدی گۆتە ژنێ فاتم چت کرد، گۆتی ئەحمەد چم نەکرد.

ئەحمەدی گۆتە ژنێ: فاتم ئێمنو توو تێپەڕی ،هەتا هەتایێ،ئەتوو کارەکەکی ئاسن بکە دەگەر گۆپارەکی ئاسن بڕۆ مەشریقێ، ئەمنیش کارەکەکی ئاسن و گۆپارەکی ئاسن ئەکەم ، ئەچمە مەغریبێ،هەتا کارەك نەدڕێ و گۆپار نەبیتە دەرزی ئەمە ئێگدی نابینینۆ.

هەردووکان وەکرد،بە دەروێشایەتی ڕۆیشتن،هەر ئێکی بەر دەمەملەکەتەکی کرد.

ڕۆژەکێ فاتم تەماشاکاکارەکیا دڕاینەو گۆپاریشیا بوویتە دەرزی،چووە سەر کانیەکێ، تەماشەی کرد ،کیژۆکەك هاتە سەکانیێ بەغار بادیلۆکەکی وێبوو،فاتمێ وەگۆتێ کیژۆرێ خێرتەگاتێ ئەرە تێنیمە بادیە ئاوەکێم دێ،

کیژۆرێ گۆت:بڕۆ ئاوێ چ؟ حەفت سارە برام بزر بووە، تازا هاتیتۆ،کووت ئاوێ دەمێ؟ برامی تێنیە، هەتا ئەو نەخواتۆ ئاوێ نادەمە کەس.

فاتمێ گۆ هەر قمۆكەكێ، گەروما ئیشك بووە، رەجای لێكرد، بادیەی لێوەرگرت، گوستیلەكی وێبوو بەبنی بادیەی وەنووساند، فاتمێ زانی، ئەوێ ئاوێ لۆ ئەحمەدیە بات.

كیژۆرە بەغاردان ئاوی لۆ برای بردۆ،ئەحمەدی چاو وەگوستیلێ كەت ناسیۆوە، گۆتیە خوشكێ: ئۆ كی لەسەر كانیێ بوو؟گۆتی كەس، سێجاری لێتیكرار كردۆ، خوشكیی هەرگۆتی كەسی لێنیە.

ئەحمەد هەرستا گۆتی : ئەمن لەسەر كانیێ نەبی ئاوێ ناخۆمۆ.

ئەحمەدیش چووبۆ ناو دێوان چونكە ئەحمەد لە دێوانە، وەكی چووە سەر كانیێ، فاتم لەوێ بوو ،ئەوجا گۆتی فاتم: چبكەم، چت لێوەشێرم، ئەمن داك و باو براو خوشكم هەموو دێون،ئەمن نەوێرم ئووهەت ببەمۆ، هەرستا فاتمی كردە قۆدیی جغارەو هاویشتیە بەر پشتێ.

لەمارێ داك و باوانی گۆت ئەحمەد بۆن دێ بۆنێ ئادەمیان دێ،لەو عەردو مەكانەی دێ،چەندی ئەحمەدی گۆت كا بنیادەم؟ وێم نیە، بیفایدەبوو، گۆتی سووندێ بخۆن چیلێنەكەن پێشانووەدەم، گۆتیان سووندێ خۆین، فاتمی هینا دەرێ و وەكی خۆی لێكردۆ.

ئەحمەد سبەینێ چووە راوێ،پیرەژنێ داكێ ئەحمەدی گۆتیە فاتمێ گۆتی هەتا هێوارێ، حەفت بەرگە بالیفی وێدان و گۆتی هەتا هێوارێ

ئەو حەفت بەرگە بالیفانە هەمان پڕی كوركێ سیخوڕیەكەی،لە دەشتێ لەدوو بگەڕێ، ئەگەنا هێوارێ بێیۆ ئەتخۆم.

فاتمێ غەریب و مار وێران بەگریانەوە بەرگە بالیفی لەخۆ هەردان و بە دەشتێدا داگەڕا خوارێ.

لە هیكڕان ئەحمەدی گەیشتێ، گۆتی ها فاتم ئۆ چاكەی لەوێ دەشتێ؟

فاتمێش وەكۆ داكتەری دەبی ئەو بەرگە بالیفانە پڕكەی لە كوركێ سیخوڕی

ئەحمەدی بەزمانێ سیخوڕان بانگكردنێ و كۆمەرەك سیخوڕ هاتن و خۆیان راوەشاندو هەر حەفت بەرگە بالیفی لێپڕكردن و هێوارێ چۆ مارێ.پیرەژنی گۆت : فاتم هینات؟گۆتی بەرێ.

پیرەژنە دێوێ گۆتە فاتمێ: ئەی بەقوربانی رایێ ئەحمەدی كا،ئۆ رایێ توو نینە،

رۆژێ پاشتر مەنجەتەكەدی بە فاتمێ گرت و گۆتی دەبی ئەو حەفت مەنجەرانە پڕی فرمێسك بكەی ، ئەگەر نا هێوارێتە خۆم.فاتم هەگریا سەری بەسەر مەنجەرێدا گرت، ئەحمەد هاتۆ گۆتی مافاتم ئەورۆلۆچەگریێی؟ فاتمێش گۆ: داكتە رێ دەبی لۆ هێوارێ ئەو حەفت مەنجەرانە پڕكەی لە فرمێسكان،

ئەحمەدی گۆ برۆ ئاوێ بكێشە، ئاوی پێكێشا هەتا مەنجەر هەموو پڕبوون، ئێجا نكە خوێیەكی هاویشتە ناو مەنجەران ، هێوارێ، پیرەژن هاتۆ گۆتی ئەورۆت چ كردیە؟مەنجەرت پڕكردینە؟پیرەژنێ گۆت خوات بەقوربانی رایێ ئەحمەدی كا ئۆ رایی تەو نینە رایێ ئەحمەدینە.

ئەحمەدی دەزگیرانەك هەبوو لە دیوان چل سەری پێوەبوون، چل سەریان تێكەیاند و وەیان گۆتی:دراتان بسوو، فاتمێ نێرینە كنەتوو و بیخۆ.

فاتمیان ناردە كن چل سەرێ، لە رێیێ ئەحمەدی گەیشتێ، گۆتی كێواچی فاتم؟گۆتی ئەچمە كن دەزگیرانێت هێرەنگێ دینم.

ئەحمەدی وەگۆ:راوەستێ رێیێت لۆ دانێم، لەرێیێ ئەگەیە كانیەكە پڕی كێم و هەوا، كەس بێز نایێ چاواش لێبكا،هەڕوو قمە ئاوەكێی لێوەخۆ، شەقە ئاوەكێش بە چاواندا كە،برێ ئۆخخەی چە خۆشی، بریا مارم لەتەنیشتە توویا،پاشی هەنگینێ ئەگەیە زەویەكە پڕی قونجركەیە،سێسەران بەناودا بە پێخواسی هەڕوو و وەرە،لەوێشە رۆی ئەگەیە هەسپەكی هێسكیان لە پێش دانانە،ئەگەیە شێرەكیش جۆیان لەپێش روو كردیە،جۆی لەبەرێ شێری هەگرەو لەبەرێ هەسپی دانێ، هێسكانیش لەبەرێ هەسپی هەگرەو لەبەرێ شێری دانێ،ئێجا هەڕوو هێرەنگا لەدەرێ بەهەوای وەكرایە، روو ببێ و هەرێ،گۆتی باشە.

ئەوی ئەحمەدی گۆتبوو هەمووی جێبەجێکرد،گەییە پێش دەرکێ، چل سەریێ گۆت: راوەستە خوشکم ئاچم لۆت دینم،فاتم روویوو هێرەنگیێ و هەرات،چل سەریێ وەكی دیتی فاتمیێ هێرەنگ بردو هەرات،

چل سەریێ گۆ هەسپە، هەسپە، بیگرە، هەسپی گۆ نایگرم،ماتوو نزانی ئەمن جۆیە خۆم هێسکان ناخۆم،ئەویێ جۆیا دایتە من،گۆتی شێرە، شێرە بیگرە، شێری گۆ نایگرم، ما ئەتوو نزانی ئەمن هێسکانە خۆم جۆی ناخۆم،ئەویێ هێسکا داینەمن،گۆتی زەوییێ بیگرە، زەوییێ گۆ:ئەتووە رێی قونجرکەم دەپێی راچن، ئەویێ سێجاران بەناومدا هاتیەو چووە بە پێخواسی، گۆتی کانییێ بیگرە، کانییێ گۆ: نایگرم ئەتوو بێزنایێ خوینێم لێفرەدەی، ئەویێ تێرا ئاو لێخواردیمۆو چاویشیا پێشووشتیمە،فاتم لەوەش دەرچوو و هێرەنگی لۆ پیرەژنێ برد.

دێوان گۆ: هەنووکە ئەمە ئەو ژنەن ناویێ و دەبی چل سەریێ وەگوێزیەوە، هەرستان چل سەریان بە بووك گواستەوە لۆ ئەحمەدی، شەوێ ئەحمەد هەرستا هەرچل سەری برین، فاتمیشی كردۆ قۆدیە جغارەو هاویشتیە باغەریێ و لێیدا رۆیشت لۆ شاری ماریێ فاتمیێ،

کاروانی دێوان وەکی چوون تەماشەیان کردیێ،چل سەر کوژرایەو ئەحمەد و فاتمیش دیار نین.

ئەحمەد رۆیشت گەیشتە گوندەكی تەماشەی كردە باراتی لێدەهات وەكی سولیە مەسینان،پیرەژنۆكەك لەدووری گوندی ،لەولای سەری گەرەكێ،دروێپەیان دەهاتن،ئەحمەد بەخۆ بە كەچپە ساقۆی وەسەبانی كەت و بانی لۆگێڕا،لەشكری دێوانیش گەیشتنێ و گۆتیانە ئەحمەدی ژنەك و پیاوەك بێرەدا هاتن ، ئەت دیتینە؟

ئەحمەدیش گۆ:دەبرۆن سەرو خۆن ژن و پیاو، ئەمن پیرە داكۆكەكا هێیە، نابینن بانیا لۆ گێرم.لەشكری دێوان بە نائومێدی گەڕانەوە.

مارێ پاشای باوی فاتمێ بانگ راێشت ، هەركێی خەبەرەكێن لە ئەحمەدو فاتمان لۆ وەرگری، دەبەر زێڕانی هەرەكێشین..

ئەوان گەیشتنۆ ئێكدی بەخۆشیان رابارد و ئەمنیش چ پێنەبرا.

---

ئەو حەكایەتە خەسووم بەرەحمەت بێ(ئەفیسە ئەحمەد كاكەمین)تەمەن ٧٠ ساڵ، نەخوێندەوار، هەولێر گەرەكی بەستەپیازە، لۆی گێڕامەوە، ساڵ١٩٨٣ .

# مەلاو کیژە پاشا

هـەبوو نـەبوو، هـەموو دەورو زەمانـان ، غـەدر لـە ژنـان کرایـە، بوختانیان پێکردینە، بەرا هەموو وەختەکیش خوا قەت زولمی لـەکن بزر نەبووە، رۆژەك هە داماتیەهەموو شتەك کەشف بووە.

ئەگێڕنۆ وە ئەرێن:

پاشایەك هەبووە، حەفت کوڕی هەبووینە دەگەر ئێك کیژی، کیژی زۆر خۆشەویا،مەلایەکیش لـە گونـدی هـەبوو،رۆژەکێی بـانگ کـردیٚ، پاشای وەکۆتیٚ:

ماموەسـتا بـە خـۆزانی ئیـك کیـژم هێیە،بەتـەمای سـەفەریٚ حەجێمە،ئەگەر خوا بە قسمەت بکات،پێم خۆشە دەرسێم بە کیژیٚ بریٚی،وەکی هاتمۆوەش چی بریٚی ئەتدەمیٚ،مەلای گۆ باشە.

پاشا وەڕێکەت لۆ سەفەریٚ حەجیٚ،کوڕەکانیش هەستان هۆدەکیان لـۆ خوشـکیٚ تاقانـە رازاندەوە،کێرکـەریان لـۆ گـرت و بەخۆشـیان حەڕەسیاتیان لە خوشکیٚ خۆگرت،

خوشـکیش سـبەینیٚ هەرسـتا چـووە کـن مـەلای هـەتا دەرسـێی پێبرێ،مـەلای گـۆت ئەگـەر ماچـەکێم نـەدەییێ، دەرسـێت پێنارێم،کیژۆرە هەرات و چارۆگی لێبەجێما.

داکیٚ گۆتیٚ کیژم ئەدی کا چارۆگت؟

گۆتی: دایـێ لـەرێیێ گەیشـتمە ژنەکـە فـەقیر ئـەبێ چـارۆگ بـوو، ئەمنیش دایێ.

داکیٚ گۆت چاکت کرد کیژم.

رۆژێ پاشتر، مەلای دیسان ئێقەی لێگرتۆوەو گۆتی ئەگەر ماچەکێم نەدەییێ دەرسێت پێنارێم.

ئەوێجارێش هەرات و پێراوی لێبەجێما.

داکیٚ دیسان لێپرسیۆ: کیژم ئەدی کا پێراوت؟

گۆتی: دایێ کیژەکە هەندە فـەقیرم دیـت ، ئـەپێخواس بـوو، پێـراوم دایێ.

داکیٚ دیسان دەستخۆشی لێکردو وەی گۆتیێ: ئیشەکی باشت کردیە.

کیژەکە بانگی داك و برایانی کردو گۆتی: بشم کوژن، ئـەمن دەرسـیٚ ناخوینم.وەشی گۆتنیٚ بەجێم نێرن بەتەنیٚ،

هەرحـەفت بـرا دری خوشـکێیان نەشـکاندو بـەجێیان نێشـت و حەڕەسیاتیان لێگرت،ئێکی لەکن نەبایە دووی لەکن بوون.

پاشا لەحەجێ گەڕاوەو گەیشتە بەغدایێ،مەلای وەدوو راچوو،پێشی هەموو شتی پاشای گۆت:مەلا کیژێ من تاکێندەرێ خویندیە؟

مەلای گۆ پاشام خۆشیی ، خویندنێ چ و حاری چ؟کیژت لەکێ بوو، حاشا عازری ئۆتێ ئەتوو وەرێکەتی کیژ هەخەریکی بێناموسییێیە،کیژت ئوهەو ئوهەیە.

پاشای گۆتە کوڕێ خۆ: ئەوە سوند ئەوە قورعان،نابێمۆ هەتا نەچن نەی کوژن و جلکێ بەخوینم لۆ نەینن، ئەمن نابێمۆ ئەوێ کاولێ.

کوڕە ئۆباو پیاوی چابە، ئەتوا لەحەجێ هاتیۆوە،گوناحەکی گەورەیە،لۆچی بکوژین،بەکێ رێی دەگەر کێتە،چەندی گۆتیان ئەمە بەخۆ حەرەسیاتنا لێگرتیە،هیچن لێنەدیتیە، لۆبە قسێ مەلایەکەی؟نەی سەلماند،ناعیلاج کوڕی هەستان خوشکیان بردە چیای و جلیان لەبەرکردن بە رووت و قووتیان بەرەللا کرد، دریان نەهات بیکوژن،تاژیەکیان کوشت و جلکێ خوشکێیان دەخوینێ تاژێ وەردان و لۆ باویان برد، ئەوجا پاشا هاتیتۆ.

کیژیش لە چیای ماوە بەتەنێ، ناعیلاج بە رووتی چووە بن درپەکێ.

کوڕەپاشایەك ناوی ئەحمەد بوو لە راوێ ئەگەڕا ،تاژیان هەرکوتا سەر بنە درپێ،ئەحمەد پاشاش چوو وەی گۆتێ: ئەتوو چی لێرە؟گۆتی بنیادەمم.

ئەحمەد پاشاش گۆت چەکەی لێرە؟

گۆتی: ئەشتەكم لۆ هەردە ،هەتا دەخۆ وەرگرم،ئەرووتم،حورمەمە،

ئەحمەد پاشاش عەبای خۆی لۆ هەردا، دەخۆی وەرپێچاو بەسەر هاتی خۆی لەسەری هەتا بنی لۆ گێڕاوە.

ئەحمەد پاشاش لەپشتەخۆی سوار كردوبردیلۆ ماریێ و زۆریان خزمەتكردوپاشی عەبیامەكی لەخۆی مارەكردو پاشی چەند ساران سیێ مندارۆكەی لێبوون، هەرسێك كوڕبوون.

رۆژەكێ پاشا هاتۆ لەراویێ، تەماشەی كردیێ ژنی لانكیێ ژینی و لای لاییێ كاو هەریشەگرییێ.

وەی گۆتیێ ئۆلۆچە گرییێ ؟

گۆتی: غوریەتییێ مارە باویێ خۆما هەستایە چەند سارە بێخەبەرم، ئاگام لێنینە، نزانم كیان مایە كیان مردیە، لۆ بیێ بەختییێ خۆ ئەگرییێم،خۆ بێداك و باو نیمە، لۆ نام بەیۆ؟

ئەحمەد پاشا هەرستا قافرەی لۆ رێك هێخست و ژنەكەیان لەسەر سوار كردو قولی ئەمین دار بوو،وەگەری هێخست،رۆیشتن ، مارە باویێ ژنەكەش چار قۆناغانە دوور بوو.

هێوارە داهات ، قۆناغیان هێخست،وەختی نووستنیێ قولی گۆتە ژنیێ ئەحمەد پاشای ، خۆم تەسلیمكە، ئەگەرنا مندارەكتە كوژم،گۆتیە قولی: ئۆ توو لەكنەخۆ ئەمینداری پاشای كوو ئەویێ دەعوایێ لەمنەكەی؟برۆ بیكوژە.

قول هەستا ئێکە لە منداراني کوشت،ژنەکەش باسکۆکەی کوڕی دەباغەریٚ نا،.

قۆناغیٚ دووەم ، هەربەو میسالی، ئیٚ سێیەمیش هەروا، هەتا قولی هەرسیٚ کوڕ لێکوشتن، لە قۆناغیٚ چارەم دا، قولی گۆت: تازە هیچ چارەت نەمان، خۆ دەبی خۆم تەسلیم کەی، ژنێش گۆت: باشە بەرا نوێژیٚ عیشاییم نەکردیە، ئاچم دەست نوێژیٚ هەرەگرم،نوێژیٚ کەم ئەوجا هەنگینیٚ.هەرستا مەسینەی دەست کردیٚ ، قولیش کندرەك دە دەستی هێخست و سەری دیکەشی لەدەستی خۆ بوو،ژنەکە چوو لە دووری قۆناغیٚ سەرە کندری دەپنجە گیایەکیٚ هێخست و هەرات، قوڕتاری بوو لەدەستیٚ قولی.

بەویٚ شەویٚ هە رۆیشت هەتا سبەینە دامات، لەماندیەتیانی خەو لێکەت، وەختەکی وەخەبەر هات،لێراما شوانە وێرکەك لەکن حەیوانیە، گۆتی شوان ماندی نەبی، لۆناییٚی جلکان بگۆڕینۆ؟.

شوانی گۆت:خانم بەجوانییٚ خۆت، گەمانم پێمەکە، کووە بی ئەتوو بەو جلکە جوانانەو ئەمنیش بەو جلکە شڕ و موڕانە بگۆڕینۆ؟

هەر کوەکی هەبوو جلکیان گۆڕینۆو گۆتیە شوانی: ها بگرە هەندە زێڕانەشت بدەمیٚ بەرخەکی لۆ من سەربڕە گۆشت لۆتوو و بەس ریخەرۆکم پێوێن.بەرخی لۆ سەر بڕی و ژنەکەش هەستا پرچیٚ خۆی لەپشتە سەریٚ خڕ کردۆو ریخەرۆکی لەسەر ئاراندن، ئێجا چووە بەر تاویٚ هەتا ریخەرۆك هیشك بوون،چەنگە لیرەکی دا شوانی و

وەرێکەت، هەرۆیی هەتا گەیشتۆ شاری مارە باوێ خۆ، چووە پێش ماریێ پاشای باو و گۆتی قازەوانان راناگرن؟ گۆتیان برۆو لای کەچچەری پیس و خەلیس، دوایێ پاشای دیت، زگی پێسۆتا ، گۆتی دەبیکەنە قازەوان.بووە قازەوان و رۆژێ ئەچووە کن قازان.هەمووی پێخەنی بوویوون، شەوێ لەدەورەی خڕەبوونۆ، ئەوێش بەسەرهات و حەقایەت لۆ گێڕانۆ.

ئێجا با بگەڕێینۆ ماریێ ئەحمەد پاشای مێردی ژنەکەی،قولیش وەسبەینێ را،گەڕاوە و ئەحمەد پاشاش لێ پرسی ، گۆتی : گەیاندتۆ جێ؟قولیش گۆ: پاشام خۆشبی : ژنت هەرسێ منداری کوشتن و هەرات لەدەستانم،

ئەحمەد پاشا هەرستا هەسپیان لۆ زین کردو وەرێکەت لۆ کن ماریێ خەزووری بەخۆ بە قول،هێواریێ مەدریس داندراو، دەعوایان کرد، کی حەقایەتەك ، بەسەرهاتەکی لەکنە بگێڕیتۆ؟قازەوانی گۆت: وای پیرە حەقایێت و بەسەر هەتم لەکنن،پاشاش گۆ دەبگێڕۆ کەچچەری پیس، قازەوانی گۆت: بەشەرتەکی دەبی دەرکێ گارە دەن، کلیرێش لەکنە من دانیێن، کیش تەنگاوە بالۆخۆ هەندیگایێ هەستی گوو و میزێ بکا، دوایێ کەس نابی بچیتە دەرێ، گۆتیان باشە ، دەدەست پێبکە.

قازەوانی گۆت:پاشایەك هەبوو، ئێك کیژو حەفت کوڕی هەبوون، پاشاچووە حەجێ، گۆتیە مەلای هەتا دێمۆلەحەجێ دەرسێم بە

کیژێ بریێ، چی بریێی ئەتدەمێ،پاشا وەرێکەت، کیژۆرەش چۆکن مەلای تا دەرسێ بخوینی، مەلای گۆت ئەگەر ماچەکێم نەدەییێ دەرسێت پێنارێم، ئەویش وەگۆتە مەلای، پێم مەرێ و هەرات و چارۆگی لەکن مەلای بەجێما، رۆژێ پاشتر هەروە .

مەلا تەنگاو بوو، خەریك بوو هەرستی پاشای وەگۆتێ، ملی خۆ بشکینە دانیشە،قازەوانی درێژەدایێ و گۆتی :داکێ وەگۆتێ:ئەدی کیژم کا چارۆگ و پێراو؟ئەویش وەگۆت: لەرێێم دانە فەقیرەکی.

رۆژێ سێیەم گۆتیە داك و برایان ئەمن چیدی ناچمە خوێندنێ، وەیگۆتە برایان پاسەوانیێم لێبکەن و بەجێم مێرن، پاشا لەحەجێ گەراوەو مەلای بەدوودا چوو،ئەویش پرسیارێ هەندێ لێکربوو گۆتبووی: داخوە کیژم کووی خوێندیە؟ مەلا ش گۆتبوو : خوێندنێ چ و حاری چ، کیژت لەبەر بێناموسیێ ئاگای لەخوێندنێ نەمایە، دوو رۆژان هات و وازی لێهینا.

وەلحاسر بەسەر هاتێ خۆی هەمموو لۆ گێرانۆ و لە ئاخیریش گۆتی ئەوەم باوە، ئەوانەم برانە، ئەوەم داکە، ئەو مێردە ، ئەوەش قول، دەستی بردۆ باغەرێ باسکێ هەرسێ مندارانیشی هینانەدەرێ وهەموو پێك شاد بوونۆ،

ئێجا پاشای گۆت: هەرون تەنەکە نەفتەکی بینن، هینایان مەلاو قولیان قۆربەست کردن و هەریان دانە ناو ئاگری ...

ئەمنیش هاتمۆو لەماندیەتیێ زیاتر هیچم لۆ نەماوە.

---

ئەو حەكایەتە ساڵی ١٩٨٣ خەسووم بەرەحمەت بێ (نەفیسە ئەحمەد كاكەمین لۆی گێڕامەوە) تەمەنی ٧٠ سال

# پیرەژنێ بوختان کەر

پاشـایەك هـەبوو، نـاوی محەممـەد پاشابوو،سـێ کـوڕی هـەبوون ناویـان(مـەحمود و حەسـەن و ئەحمەد)پاشـای بـانگی کـوڕان کـردو وەیگۆتنێ،کـوڕم وەکـی ئـەمن مـردم، سێشـەوانم نۆبـەتێ لەقـەبری بگرن.

وەکی باویان مرد، هێکـان نۆبـەت لێنەگرت،ئەحمـەدی گۆت: براینـە ئـەدی ئەمـە شـەرت دەگـەر بـاوی نەگرتیـە، سێشـەوان نۆبـەتێی لـە قەبری بگرین،گۆتیان کوڕە دەبڕۆ باو لۆخۆ مردیـە ، ئەمـە لـۆ بچـین خەوێ لەخۆ حەرام کەین؟

بە ناعیلاجی ئەحمەدی قسێ خـۆ بـردە سـەری، شـەوێ ئێکەم،چـوو نۆبەتی لێگرت، چوو لە نێزیك قەبری ، هەندەك(کەڕەنگری) بەسەری خۆ دادا و خۆی شاردۆ،وەکی شەو راشکا سـوارەك لەهـەوای راهاتـە خوارێ،هەسپی هەری رەش بوو،ئەلبیسەی هەری رەش بوو،دوو رمی لەبن کەوشێ هینانە دەرێ،لەزگ بوولەقەبری دا،گۆتی محمد پاشا بە زیندیم زەفەر پێنەبردی، بە مردیم کوو لەبەر دەستان خەلاسەبی؟

ئەحمەدی تیرەك گرتیێ و کوشتی و کەپولووتی لێکردنۆو دەناو توورەکەی ناو هەسپ و شیری بردن و مەیتی فڕەداوچووە ماریێ پیرەژنۆکەکی ، هەسپ و شیری لەویێ دانان و.

سبەینیێ پاشی وەیگۆتە برایان پیاوی چابن بابچین نۆبەتیێ لەقەبری باوی بگرین،برایان وەگۆتیێ دەبڕۆ دەخۆ هەردە، شەویێ دی هیچ بوو ؟هەتا ئەو شەو بچین.بە ناعیلاجی شەویێ دووەمیش چۆ سەر قەبری باوی، دیسان وەختی شەو راشکا،دەنگەك هات لەعاسمانیێ تەماشەی کرد،وەکی برووسکیێ شۆقی براو کردۆ،ئەو جارەی هەسپی هەری سۆربوو، جلکیە سۆر بوون،وەکی ئی شەوی دی، تیرەکی گرتیێ و ئەویشی تۆپاند.دم و لووتیێ ئەویشی بڕین و دەناو توورەکەی نان،هەسپ و شیریێ ویشی بردنە کن ئیێ دی.

ماوە شەویێ سێیەم بەو میسالی وەکی شەویێ دی و شەوادی ،سوارەك هاتە خواریێ، ئەوجارەی هەسپی سپی بوو، جلکیە سپی بوون، ئەویش وەکی ئێدی تۆپاندو کەپوو و لۆتیێ ویشی بڕین و دەناو توورەکەی نان،هەسپ و شیری ویشی بردنە ماریێ پیرەژنیێ.

ئەو سیێ برایە زۆرە دەورەمەند بوون، مارەکی زۆریان لەباویەوە لۆ بەجێمابوو.

پاشایەکی دی هەبوو، سی کیژی هەبوون، هەندە ئەجوان و پێش چاو بوون، درت نەدات تەماشەیان بکەی ،ئەو پاشایە سێکیژەکانی

بردنە بەینی سێ بەحران، بانگی لێڕاپێشت ، هەرکەسەکی بتوانی بچیتە ئەو جێیەی کیژێ من مارەیی لەوان هاتبی،.

سبەینێ هەرچی کووچە کەرەکیشی هەبوو ، وەڕێکەتن،هەندەك سواری وەراغان بووبوون، هەندەك بە پێیان.

ئەحمەدی گۆتە برایان دەوراغەکیش وەمن دەن کەچە بارگیرەکیان وێدا، دەستی لەسەر پشتێ دانا پشتی گەیشتۆ عاردی، هەرلەوێی سەربڕی و لۆمێروانی بەجێهێشت،چۆمارێ پیرەژنێ هەسپی رەشی دەرینا و جلکێ رەشی دەبەر کردن و سواربوو،لە شرقەی بارای داو گەیشتە ئەو جێی و خوشکێ گەورەترێی هەرگرت و لەپشتەخۆی داناو هینایۆو بردیە مارێ پیرەژنێ،ئەو گەڕابووەوەش عالەمیش تازە ئەچوون.

سبەینە داهات وەکی دوونێ ، ئەوجارەی هەسپی سۆری دەریناو جلکێ سۆری دەبەر کردن و لەشرقەی بارایداو چوو خوشکێ ناوەنجیێی هەرگرت و لەپشتەخۆی سوارکردو گەڕاوە، ئەویشی بردە مارێ پیرەژنێ.گۆتی براینە ئەرێ چ هێیە؟ ئەو عالەمە چەکات؟

گۆتیان وەڵلا برام کەس سەر لێدەرناچی،ئۆ دوو رۆژە سوارەك دێ هەر بێنێ نەوعە وراغەکیا وێیە، جلکەکی نوێی دەبەر دایە،دوویا هینایە ئێکا مایە،بەهەمانیشیە کەونە دوێ زەفەریان پێناچی.

ئەحمەدی گۆت برام دەگەرەخۆو نەبردم ئەمیش ئەو بەزمەی ببینم، ئەو رۆم وراغەکی وێدەن، داخوا ئەمنیش نایێم،وراغەکیان وێدا

دەستی لەسەر پشتیێ دانا پشتی گەیشتە عاردی، ئەویشی كوشتۆوە، دوو كسۆكە تۆری لەویێ بوون، گۆتی بائەوەش لۆنگۆبی.

ئەویێ جاریێ هەسپی سپی دەریناو جلكیێ سپی دەبەر كردن و لێیدا رۆیی و لەشەرقەی بارایداو چوو خوشكیێ كچكەشی هیناو لەپشتەخۆی سواركرو ئەویشی هینا ماریێ پیرەژنیێ.

ماوەكی ئاگای لەبرایان نەبو، رۆژەكیێ چوو سەریان لێیدا ، هەندی قوماریێ بكەن، هەردوو ك سفربووبوون،ئەوجا ئەحمەدی گۆتنیێ عەیب ناكەن، سیێ رۆژ بوو لەبەروە پاڕامۆ وەمەگۆتنیێ بابچینە سەر قەبری باوی بەقسیێ و نەكردم، وەنیە؟ گۆتیان با، گۆتی هەرسیێ شەوان چوویمە نۆبەتم لێگرتیە سیێ دێوم كوشتینە ئەوەش دم و لووتیان، دم و لووتی لەپێش هەر رێشتن، ئەو سیێ كیژیێ پاشاش هەرسێك ئەمنا هینایە، برۆن بابچین ،بینە پیاو هەرێێكەو كیژەكی لێمارەكردن و هەرێێكەی هەسپەك و شیرەكیشی دانیێ، لەبەر ئەوەی چ خانی و ماریان نەمابو ، هەموویان لەقوماریێ دۆڕاند بوو، لۆیێ چوون لەسەر مێرگەكیێ خیمیان هەردان .رۆژیێ ئەچوونە راویێ و هێوارانیش داتنۆ،ئەحمەدی تەماشەی ژنیێ خۆ كرد، رۆژبەرۆژ هەرلەكورتییێ داو لاوازەبی،هەردوە براژنیشی هەرەقەرەو بوون،گۆتی عەجایب دەبی چ مەسەلە بی ،ئیێ من هەلاوازەبی ئیێ برایانیش هەقەرەوەبن،گۆتی دەبی ئەو سرەی كەشف كەم،گۆتیە ژنیێ قسێم

لۆ بکە ، ئەتوو لۆ ئیوهـە لێاتیـە. لـۆ ئیوهـە تێك چـووی و زەعیـف بووی؟ژنێش قسە لۆ کرد.

گۆتی: هەموو رۆژێ پیرەژنوکە ك دێت سێ دەرزیان لەبەر بەرچێرێ خـۆ دەردینـــی، ئــەو دەرزیانــە ئەبنــە بەچــکە دێــو، دەو ژنانــە بەرەبن،هەرچی خەرابە دەگەریانەکەن، گۆتی ئەمنیش نـاپێرم ئێجا بەهەمان بەژنەکان و بە بەچکە دێوان لەمنەدەن،بـەرا ئـەورۆ مەچۆ راوێ ، بەخۆ تەماشەکە ئەگە درۆیێ بکەم وەرە بمکوژە.

ئەحمەد گەڕاوە ، گۆتیە برایان ئەمن نایێم شیرما لەبیرچووە،گەڕاوە وەکـی تەماشـەی کـردێ بەهـەمانیان لـە ژنـێ ویـەدا،دوایێ ئەحمـەد چۆوە راوێ ،

ئەحمـەد زۆر تووڕەبـوو، گۆتیـە ژنـێ وەرە لـەپێش پیرەژنـێ ئـەو شتەی بەحس بکە کە ئەو پیرەژنە چ فتنەکی نایتۆ، ژنێ ئەحمەدیش هەموو بەسەر هاتی گێراوۆ، برایێ ئەحمـەدی وەکـی زانیـان خـەتایێ پیرە ژنێ بووە، هەرستان پیرەژنیان لە دارەکێ بەستۆوەو سێشـەو سـێ رۆژانیـان چشـتاقە ئەشـیا نـەدایێ، هـەتا لـە ئـاخیری پـیرەژن لەبرسان مرد.

ئەوانیش بە خۆشی ژیان...

---

ئەو حەکایەتەش خەسـووم نەفیسـە شـێخ ئەحمـەد شـێخ کاکـەمین، ساڵی ١٩٨٣ بۆی گێڕامەوە...

# سێ دز

هـەبوو ، نـەبوو، سـێ دز هەبوون،هەرسـێکان ئێگـدی گرتۆ،وەرێـك کـەتن کـە بچـنە دزیـەکێ، مـاوەك بـوو دزیـان نەکردبوون،هەسـتان وەرێکەتن،چـوونە ئەشـکەفتەکێ،ئەوێ ئەشـکەفتێ مـەڕی شـوانەکی لێمۆرەکرا،هەرسـێکان خـۆ دەبـن پـووش و پەراشـی نـا،هێوارە داهات،شـوانی حـەیوان هینـاوە ئەشکەفتێ،شـوانی هەرسـێ دز دیتن،حەیوانی داکردە ئەشکەفتێ، بـانگی کـوڕی کـرد و گۆتی کـوڕم ئەوڕۆ هێوارێ نانی پشێ پێنج کەسـان لێنێ،کـوڕی گۆ تۆبـاو ئەمـە هەر دوو کەسین، لۆ پشێ پێنجـان لێنـێم؟ شـوانی وەگـۆ کـوڕم سـێ مێوانیشن هاتینە،وەکی دزان وەگوێ لێبوو بەناعیلاجی لەبن پووشێ هاتنـە دەرێ و چـوونە کـن شوانی،شـوانی زۆر بـەخێرهینان و گـۆتی ئـەنگۆ دزن؟ گۆتیـان ئـەرێ وەڵـلا شـەرمێ لێـك نەکـەین دزیـن و هـاتبووین دزیـێ لـەتوو بکەین،شـوانی گـۆ وەرن واز لـەدزیێ بیـنن، هەرئێکی مەڕەکێوە دەمێ، گۆتیان رازی نابین.

شوانی گۆ: مادام وازنابنن با بەسەرهاتەکی خـۆو لـۆ بگێڕمـۆ داخـوە چم لێبەسەر هاتیە لەسەر دزیێ،ئەمنیش وەکی نگۆ دزبووم،هەسـتام

دەگەر دوو دزی دی رێك کەتم، چووینە سەر رێیەکی دانیشتین دیتن پاشایەك بەسواری بەوێدا هات،ئەمەشی لێچووینە پێش و رێن لێگرت و وەنگۆتیێ لەهەسپی وەرە خوارێپاشـای گۆت لەسـەر رێیـێ مـن لاکەون، رێیێ من بەنگۆ ناگیرێ،پیاوێ باش بن خۆ لـە چ هـەرەتان مەدەن.ئەمەش گوێن نەدایێ زیاتری لێچووینە پێش،وەنگۆتێ وەرە خوارێ فرتە فرتی پێناوێ،بەچاوێ خۆم دیت پاشا لە هەسپی هاتـە خوارێ،هەرسـێکی دەخـۆرێ گـرتین، هـەتا سـکوردێ دە نـاو خۆرێدابووین،تووڵەکیشـی لـەکن دانـاین، گۆتیـە تووڵـەی هـەر هەناسـەیان خواردۆ،مێشـکیان بشـکینەو بیـان خۆ،بـەخۆش رۆیشت،لەپێش چـاوێ مـن تووڵـە مێشـکی هـەردوو رەفیقـێ منـی شکاندو خواردنی، ئێجا هاتە سەر سەری من، کەهەر هەناسێ بخۆمۆ ئـەمنیش بکوژی،هـاوین بـوو، تووڵـە مانـدی بووبوو،سـەری بەسـەر سەری مندا هینابوو،ئەمنیش تـەواو لـەخۆ وەرەز بووبـووم، هـەر زوو نـەمکردە نامـەردی پـرم دا سـکوردی تووڵـەی و بـەدرانانم گـرت و ،دەگەر تەکانێ من و تووڵـەی لـەناو خـۆرێ هاتمـە دەرێ و تووڵـەم کوشت وچوومە سەر دارەکـێ،دیتم پاشـا گەڕاوۆ،گەیشـتە بـن دارێ، خەنجەرم هینا دەرێ و خۆم هاویشتە سەرێ و کوشتم وجلکێ پاشام دەبەر کردن وهەسپ خۆی نەوی کردو ئەمنیش سوار بـووم، لـەرێیێ چـەندی کـردم پـێم نـەکرا لـەرێیێی لابـدەم و بیبـەمۆ مارێ،هەسپ بەکەیفێ خۆ رۆیشت.هەتا گەیشتە نـاو شارێ،چـوو لـەپێش قەسرێ راوەستا.دیتم دوو کەس بەپیرمەوە هاتن ، ئێکەکی خۆ نـەوی کـردو

ئەمنیش پێلەسەر پشتێ داناو لەهەسپی هاتمە خوارێ،چوومە ژۆرێ و دانیشتم،دەستشۆریان هێتناو دەستم شووشتن،نانیان هێناو خواردم دیتم حەپەسان هۆدە لۆ چۆلکردم،ژنەکە زۆر جوان بەدەستووری کیژەپاشایان،هاتە ژۆرێ و وەی گۆتمێ ئۆلۆ خۆت تەنها نەکردیە؟جلکت لۆ لەبەر نەکردینە؟چیە دەرێی ئەورۆ زەوقت نیە؟.

ئەمیش مەسەلەکەم بەتەواوی لۆ گێڕاوە گۆتم هەرەم کوژن، بابەتەواوی وەیان برێمێ، گۆتم ئەمن مێردی توو نیمە،.

ژنەکە هیچی خۆ تێك نەدا،گۆتی قەیدی ناکا ئەمن لێت لەهەڵلا نادەم و نات کوژم،تازە ئیشەکەت کردیە،خۆت ئاشکرا مەکە، ئەگەر بزانن بەخوای پارچەپارچەتەکەن.وەکی سبەینە داهات هەرۆ سواری هەسپی ببەو لەولای شاری هەسپی بەرەڵلاکەو وەکی هەسپ هاتۆ ئەزانن کە پاشا کوژرایە،سبەینە داهات جلکێ پاشام دەبەر کردنۆو نانم خواردو سواری هەسپی بووم ولەولای شاری بەرەڵلام کرد.

ئەوجا دزیکردن نەتیجەی باش نابی، وەرن واز لێبینن هەرئێکی دوو مەڕانوە دەمێ.دزان گۆت وەڵلا واز نایێنن.

شوانی گۆت مادام وازلێنایێنن بابەسەر هاتەکی دیکەو لۆ باس بکەم:کابرایەکی گایەك هەبوو چەندی ئەمکرد پێم نەدزرا،هەرستام بوومە خورامی هەرپێم نەدزرا،کابرا کیژێ خۆی لێمارەکردم و ئیدی بوومە جۆتیاری، رۆژێ ئەچوومە جۆتی و هێوارانیش داتمۆ مارێ.

ڕۆژەکێ لەجۆتی بووم، وەختەکی گارە گارەك دەهات، ئاوڕم داوێ تەماشاکەم خەرکی گوندی بەژن و پیاو و مندارەوە هەمان غارەدا لۆ کنەمن، ئەمیش هەراتم، گۆتیان کوڕە هەرنێی مەترسێ، گوێم دایێ هەمووە گریان، گۆتم باشە لۆچە گریێن؟گۆتیان ژنتا مردیە، ئێئەوجا ژنم مردیە مردیە ئەنگۆ لۆچە گریێن؟ گۆتیان ئاخر ئەتوو عادەتێ مە نزانی ، ئەگەر ژن بمری دەبی مێردیشی دەگەر هەردەنە بیرێ، کوڕە پیاوی چابن ئەو ئیشە کووەبی؟ لەچ جێیێ ئەو ێ دنیایێ شتی وامەیە ؟ویستم هەریم، گرتمیان و حەفت نوردیەنان و کوندە ئاوەکیان لێقەیم کردم،وش وش هەریان داینە بیرێ، تەماشەم کردێ، بیر پڕو پڕ ی هێسك بوو، ئاوێرام تێریش بخۆم و بخۆمۆ لەترسێ هەندێ نەکە نان و ئاوم لێببڕێن، ئاخر ڕۆژ بوو دوو پارە نان مابوون خواردنم .نان و ئاوم لێخەلاس بوو، ئەمنیش زۆر عێدزبووم چاوەڕێی هەجەلێمە کرد، وەختەکی وش وش جەنازەکیان هەردا خوارێ، ئەوێجارێ کابرایەك مردبوو ژنیان دەگە هەردابووە خوارێ، هەستام هەرلەناو بیرێم ژنەکە لەخۆ مارەکرد، ماوەکی زۆریش بەنان و ئاوێ وێن رابارد.ئەویشن تەواوکرد، زۆر بە عێدزی دانیشتبووین، چاوەڕێی مەرگی خۆنەکرد، وەختەکی خرتەخرتەك دات، تەماشەم کردێ ریوی بوو هێسکیەخواردن، گۆتمە ژنێ مادام ریوی هاتبیتە ژۆرێ دیارە رێیەك هێیە پێدا هاتبیتە ژۆرێ،گۆتم ژنێ ئەمن خۆ دەلاقی ریویەکەم ، ئەتووش لاقێ من بگرە و بەتەمای خوای بەرکی بچینە دەرێ.

ئەمن خۆ دەلاقیٚ ریوی كردو ژنێش لاقیٚ من گرتن و ریوی راپەڕی رایكێشاین، لەهەندەك جێیان لەسەر زگیە ڕۆیشتین ، لەهەندەك جێیانیش بەپێوە ڕۆیشتین، وەختەكی تروسكاییەك پەیدا بوو، خەنی بووین، گۆتن تازە نەجاتن بوو،هاتینە دەریٚ،تەماشەم كردیٚ چیایەكی لووس و تووس بنیشی بەحربوو،گۆتم بریا هەلەناو بیرێدا مابایەنۆ تا ئەمردین.وەمگۆتە ژنیٚ، ئەمن خۆ هەرەدەمە ناو ئاویٚ، ئەگەر گەیشتمە هیچ ئیشكاییان ئۆ بانگتەكەمیٚ ئەتووش وەرە، ئەگەر ناش ئێگدین نەدیتۆ گەردەنێم ئازاكەو خوا حافیز.خۆم هەردا ناو بەحریٚ ، لەهەندەك جێیان ئەكەتمە بن ئاویٚ، لەهەندەك جێیانیش سەراوە بوو م، وەختەكی گەیشتمە هیشكایەتیٚ و بانگی ژنێشم كرد، ئە ویش خۆ هەرداو ، وەختەكی ئەویش گەیشتە كنە من.

ئەو كوڕەی دەگەریشم دایە لەو ژنەیە، وەرن واز بینن ، ئۆلۆم كردنە هەرئێكی سیٚ مەڕ.گۆتیان واز نایەنین. دەمادام وێیە گویٚ بدەنیٚ با ئەو بەسەر هاتەشو لۆ بگێڕمۆ: گۆتیەوەكی نگۆ ئەمەش سیٚ دز بووین.لەجێیەكی دانیشتبووین دیتن مامزەك بەكنەمەدا رۆیشت،ئەمەش هەرسێكی وەدوو كەتین لەهەندەك جێیان مامزانەوەستا هەتا ئەمەیە گەیشتینیٚ ،پاشیٚ وەكی ئەمەی لێنێزیكە بووینۆ پێی بەغارێوا ناوۆو هەردات،لەو گردی لۆ ئەو گردی، لەو زووركی لۆ ئەو زووركی ئەو دەردەی داینیٚ، هەتا هێوارەن

بەسەردا هات،مامز لەپێش چاویٚ مە چۆ ناو ئەشکەفتەکیٚ، ئەمەش هەرسێك لەدوو ویٚ چووینە ژۆریٚ.گۆتن تازە گرتن،گەیشتینە ناو ئەشکەفتیٚ مامز بووە دێوەك هەندی کەرتکە چیایەکی، بەردەکی گەورەی دەستکردیٚ و بەدەرکیٚ ئەشکەفتیٚ ی وەناو گۆتی ئەوجا کێوا چن؟کووم لەبەر دەستان خەلاسەبن؟.دەستەکی لەپشتی برادەرەکی من دانا و گۆتی : ئەتوو لۆ مەغریبیٚ باشی،دەستەکیشی لەپشتیٚ ئەوی دیدا گۆتی ئەتووش لۆ نیوەی شەویٚ باشی،لۆلای منیش هات و دەستی لەپشتیٚ دام گۆتی ئەتووش لۆ وەختی بەیانی باشی.

مەغریب داهات لەپێش چاویٚ من شیشەکی ئاسنی لە پشتیٚ برادەریٚ من داو دوو جاری بەسەر ئاگریدا هیناو سۆری کردۆو خواردی،نیوەی شەویٚ داهات ئی دووەمیشی سۆر کردۆو خواردی،ئەمن بەتەنیٚ مامۆ،هات وەختی بەیانی دابیٚ،لەغەیبەوە دەنگەکم هاتە گوێی و گۆتی هەستە دێوا نووستیە،دێویٚ حەیوانەکی زۆری هێیە،هەرۆوە ناو مێگەلیٚ نێریەکی سپی دەناو دایە، زوو هەرۆوو ئەو نێریە سپیەی بکوژۆوەو بیگروینەو کەوری کە و هەرۆوە ناو پیستی،زەنگوریٚ نێریش دەملی کە،وەکی سبەینە داهات بانگتەکات ئەریٚ نێری وەرە هەروو لەپێشی راوەستە، وەتەرێتیٚ:نێری ئەورۆ مێگەلیٚ ئەبەیە فرانە جێی ، باشیانە لەوەرینی، لەفرانە کانییٚ ئاویانەدەی،وەکی

هێوارەش داهات زوو دەیان هینیۆ،ئەتووش زەنگوری راوەشینە، یەعنی باشە.

بەس پێشی بچیە ناو پیستی نێری ، دێوێ خەوا لێکەتیە،هەرو ئەو شیشەی جوان سۆر کووە بەهەموو هێزێ خۆ شیشە ئاسنی سۆر بوویۆ دەناو هەردوو چاوێ دێوی راکەو ئێجا هەرێ.

هەرستام ئەو شتانەم هەموو کردن، وەکی شیشەئاسنم دەچاوێ نێری راکردن و کورەم کرد، لەهاڕژنی دا،گۆتی ئەوەت دەگەر کردم، با حەیوانی بنێرمە دەرێ ئێجا ئەزانم چت لێکەم.

سبەینە داهات دێوێ بانگ کردمێ ، چوومە پێشیڕاوەستام ، گۆتی نێری: ئەمنیش زەنگورم راوەشان، گۆتی: نێری ئەورۆ ئەوێ مێگەلێ ئەبەیە فرانە جێی، لە فرانە جێی ئەیان لەوەڕینی، لەفرانە کانیێ ئاویانەدەی ،هێوارێشیان زوو دینیۆوە، ئەمیش زەنگور لۆ راوەشاندو دەستی کردە ئێك ئێکەو هەتا هەموو مەڕو بزن هەموو چوونە دەرێ،وەکی زانی هەموو چوونە دەرێ، تاشەبەردی دەست کردێ و بەدەرکێ مغەیرییێ وەناو قەپاتی کردو گۆتی: ئێجا کێوە روحێ خۆ قورتارەکەی؟لەدێوی وابی ئەمن هەر لە ژۆرێمەو لەی وابی نەچوویمە دەرێ.

ئەمنیش گۆ: تازە ئەتوو روحێ خۆ چ لێکەی کافر؟ئەمن ئۆ لەدەرێمە، چووم خەرکی گوندم هینان دێون کوشت و ئەو حەیوانەش ئی ئەوێ دێوێە.

ئـەوجا وەرن مـەردی خـوای بـن واز لـە دزیـێ بیـنن ئـۆ لـۆم کردنـە هەرئێکی چار مەڕ.

هەر ئێکی چار مەڕم دانـێ ، ئـەوان واز لـەدزیێ هینـاو چـوونۆ مـاریێ خۆ.

ئەمنیش حەکایەتم خەلاس بوو و چم پێنەبرا.

---

ئەو حەکایەتە هەشتاکانی سـەدەی رابـردوو لەلایـەن (جـەبار حمـد قـادر) خەڵکی هـیران، دانیشـتووی بالیسـان ئـەو کـات، ئێسـتا تەمـەنی شێسـت ساڵەو دەرچووی ئامادەیی یە.

## سەعد و سەعید

پیرە مێردەك هەبوو زۆری فەقیربوو،ڕۆژێ ئەچوو لەچیای بارە دارەکی ئەبردە شاری و بە چار ئەستوورکە نانیەدان لۆخۆو ژنێ و دوو کوڕیشی هەبوون بەناوی سەعدو سەعید.

ڕۆژەکێ لەداران بوو داریەکردن، تەیرەکی دیت ، راوی کردو گرتی، ئەوی سەرکی ئەو تەیرەی خواردبا ئەبووە پاشا، ئەوی دڕکێ ئەو تەیرەشی خواردبا ئەوی گۆتبای لۆیەبوو،پیرەمێرد خوا لۆی هینابوو دەورەمەند بوو،ڕۆژەکێی وەگۆتە ژنێ عەزم لێیە ئەو سار بچمە حەجێ، خوایا دایە بەس دەبی زۆرت ئاگا لە سەعدو سەعیدان بی.

پیرەمێرد وەڕێکەت چووە حەجێ، جوەکیان جیران بوو، دەگەر ژنێ پیرە مێردی خۆی لێك دابۆوە،جوو وەکی وەی زانی مێردی چوویتە حەجێ،هەستا چووە کن داکێ سەعد و سەعیدان،وەی گۆتێ:دەبی ئەو تەیرەم لۆ بکوژێۆلەسەر برنجی دانێی،بەس نابی هیچی لێکم بی،نەسەرك نەدرك، ئیلا کورك و ریخەڕۆکانی لێفڕەدە.

ژنەکە هەستا تەیری کوشتۆو عازری کردو شیوی تێکردو چاوەڕێی جووی بووکەبێت،هەرنەهات، ژنەکە هەرستا چۆ دەرێ،سەعدو

سەعید هاتنۆ ماریٚ،تەماشەیان کرد تەیر کوژرایتۆ و لێندرایەو لەسەر برنجیش داندرایە بەس خواردنیەویٚ،سەعیدی سەرك خوار،سەعدیش درك خوارد، هەردووك چوونە ناو کەندویٚ،گۆتیان بزانین داکیٚ مە ئەو رەشە شیوە لۆ کیٚ لێنایە؟.

بەینەك پێچووداکیان هاتە ژۆریٚ، جووش پەیدا بوو، گۆتی :کا شیوت لێنایە؟گۆتی ئالێم نایە،جووی گۆت خۆ کەس چ لێنەخواردیە؟ژنەکەی گۆت کەس چ لێنەخواردیە.شیوی هینا لەبەریٚ جووی دانا،جووی تەماشەکی کردیٚ،سەرك و درکی دەگەر دانینە،گۆتی ئۆ کیٚ خواردینە؟ژنەکەی گۆت هەبی نەبی سەعدو سەعیدان خواردیە،جووی وەگۆ: هەرکەسەکی خواربیتی ئەمویٚ ئەو کەسەم لۆ بکوژی و سەرك و درکانی لە زگی بینیە دەریٚ لۆوەی ئەمن بیان خۆم.جوو لەخەفەتان هەرستاو رۆیشت،ژنەکەش هەستا چووە سەر بانی داخوە سەعدو سەعید دیارنینە تا بانگیان بکات و بیان هینیتۆ ماریٚ.

سەعدو سەعیدیش لەناو کەندویٚ هاتنە دەریٚ و دەسرۆکەکیان هینا پڕیان کرد لە نانی و شیویٚ،لێیاندا رۆیشتن و ماریان بەجێهێشت.گەیشتنە سەر کانیەکیٚ نوێژیان کردو نانیان خواردو هەرستان وەرێکەتنۆ،گەیشتنە دووریانەکیٚ لەسەر رێیەکیٚ نویسرابوو رێیٚ هاتیٚ، لە ئێدیش نویسرابوو رێیٚ نەهاتیٚ،سەعیدی لەسەر باسکی سەعدی نویسی سەعید، سەعدیش لەسەر باسکی سەعیدی

نویسی سەعد. هەتا لەدوا رۆژ ئێگدی بناسنۆ،خوا حافیزیان لێکدی کردو هەرکەسە بەرێیێ خۆدا رۆیشتن،سەعید لە رێیێ هاتێدا گەیشتە شارەکی، پاشایان مردبوو، بازیان هەرەدا، باز لەسەر سەری هەر ئێکی بنیشیتۆ ئەو کەسەیەکەنە پاشا،باز گەڕا چوو لەسەر سەری سەعیدی نیشتۆ.

گۆتیان بازێ غەرەت کردیە، داخوە ئۆ کوڕی چ دەرۆزەکەرەکیە، هەستان سەعیدیان بردە ناو خانیەکی ، بازیان هەرداوە دیسان، باز هەر گەڕا هەتا کونەکی دیتۆ چوو لە ژۆرێ لەسەری نیشتۆ،ئەوێ جارێ سەعیدیان برد دەناو مزگەفتێیان کرد،لۆ جارێ سێیەم باز دیسان چوو لەسەر سەری نیشتۆ،باز هەردانیش بەس سێجار بوو،گۆتیان فایدەی نیە، دیارە قابیلیتی بیهینن بیکەنە پاشا،، سەعیدیان کردە پاشاو کیژێ پاشای مردیشیان لێمارەکردو دەپاریان کردو ماریان لۆ داناو ئەوجا با لێرە سەعیدی بەجێبێڵین و بچینە کن سەعدی بزانین سەعدی چ کردیە.

سەعدیش بەرێیێ ئەهاتێدا رۆیشت، لەرێیێ تەماشەی کرد دوو کەس بەشەڕدەهاتن،سەعدیان گەیشتێ و لێکی کردنەوەو لێی پرسین: ئۆلۆ بەشەڕ دێن؟گۆتیان لەسەر کراوی(سەخرە جندی) و ئەو مافوورەی،وەی گۆتنێ، ئۆ چ ئیستیفادەیان هەیە؟گۆتیان هەرچی ئەو کراوەی لەسەری نێ کەسی نابینی ، ئەویش هەموو عالەمێ

ئەبینی، ئەو مافوورەش هەرچی لەسەری دانیشی و بریٚ(قوم بە ئیزنت یا الله ) لۆ هەر جێیەکی بتویٚ ئەتباتە ئەوێندەریٚ.

سەعدی گۆت راوەستن ئەمنو پێك دینم،گۆتی ئەمن تیرەکیٚ لۆ ئەولای داوێم و ئێکێش لۆ ئەولای، هەرچی زووتر تیریٚ بینیتۆکنەمن کراوی سەخرە جندی ئی ویەو مافووریش ئیدیکەیە،گۆتیان باشە رازینە،سەعدیش تیرەك لۆ ئەولای تیرەکیشی لۆ ئەو لای هەردان، ئەوانیش پیٚ بەغاریٚ وەنا،سەعدیش کراوی سەخرە جندی لەسەری ناو لەسەر مافووریش دانیش و گۆتی قوم بەئیزنت یا الله لۆ سەر قەسریٚ مەنیجاییٚ،بەیەك دەقەی گەیشتە سەر قەسریٚ مەنیجاییٚ، تەماشەی کردیٚ هەرچار دەوریٚ قەسریٚ مەنیجاییٚ هەمووی خێمەیە هەردراینە، هەمووی ئیٚ عاشقانن،هەموو خێمیٚ کەسك و سۆر،گۆتی عەجایب ئەو هەموو خێمانە چنە؟سەعد لەسەر قەسریٚ بە قادرماندا هاتە خواریٚ کەسی نابینی کراوی سەخرە جندی لەسەریە.چووە کن خێم درووی، گۆتی خێمەکێم لۆ بدرو بەرا دەبی لباد بی،چ رەنگانی لێمەدە، خێم درووی خێمەك لۆ دروی لە لبادی چ رەنگیشی لێنەدان، لۆشی هەردا لەناو خێمیٚ عاشقان،مەنیجاییٚ هەموو نیوڕانان سەری لە عاشقانەدا،ئەچووە کنیان و هەر ئێکی قاوەکیەدانیٚ،تەماشەی کرد خێمەك هەردرایە چ رەنگی لێنەدراینە، بانگی کێرکەرێی کرد و گۆتی ئەو خێماهیٚ ئیٚ کێیە؟هەڕوون وەیبرێنیٚ باخێمیٚ سۆرکات،سەعدی وەگۆ: ئەمن خێمیٚ سۆر ناکەم،

سبەینە داهات سەعدی وەگۆ وەڵڵاهی ئەمن وەکی ئەو عاشقانە بەبێدەنگی لێرە دانانیشم،لەسەر مافووری دانیشت چووە سەر قەسرێ و کراوی سەخرە جندی لەسەری ناو کەسی نابینی چووەکن مەنیجایێ،برنج و گۆشتی لەبەرێ بوو سەعد کەتە سەرێ هەتا مەنیجایێ پارەك لێدا ئەوی شیو خەلاس کرد، مەنیجایێ گۆتە کێرکەرێ کێ شیو دەگەرەمن خوارد؟شیو خەلاس بوو ئەمن چ نەخواردیە،کێرکەرێ گۆ : ئێ خانم ئەمە چسوانین، کەس لێرە بووە هەتا شیوێ دەگەرەتوو بخوات؟رۆژێ پاشی هەر بەو میسالی،مەنیجایێ گۆت ئەگەر ئەتوو بنیا دەمی خۆ ئاشکراکە ، ئەگەر بنیادەمیش نی خۆم لێوەدوور بێخۆ،شەرت بی مارەبیێ منیش لەو کەسی بێ ئەوی شیوی دەگەرەمن خواردیە.

سەعدی خۆ لێئاشکرا کردو گۆتی وەڵلا ئەمنم ناویشم سەعدە، مەنیجایێ بانگی مەلای کردو خۆی لە سەعدی مارە کرد،چوونە سەر قەسرێ، سەعدی گۆ سواری مافووری بە با پیاسەکی بکەین،هەردووك سواری مافووری بوون و گۆتی قوم بەئیزنت یا اللە لۆ بەینی حەفت بەحران،بە دەقەکێ گەیشتنە بەینی حەفت بەحران، گەلەك کەیف و خۆشیان کردن،چوون لەبن دارەکێ سەعدی سەر وەسەر کۆشێ‌مەنیجایێ کردو خەوی لێکەت،مەنیجاش پێلەقەکی لە پشتێ سەعدی داو درکێ تەیری هیناوەو هاویشتیە زاری و خواردی،سواری مافووری بوو و گەیشتۆ سەر قەسرێ خۆ،

سەعدیش بەتەنێ بەجێما،وەختەکی بەهاییی هات تەماشەی کردێ کەسی لەکن نەمایە،چووە سەر بەحرێپشتێ خۆی وە قاپە بیەکێ دا،تاقمە پەریەك هاتن لەسەر بیێ هەر نیشتن ،گۆتیان ئای های ئەوەش عاشقێ مەنیجاییێ یە لۆیێ کەتیتە ئێرە.گۆتیان وەکی ئەمە رۆیشتین هەندەك پەلکە بی ئەکەونە خوارێ ،با ئەو پەلکە بیانە دەبن پێییێ خۆ بدات بەسەر ئاوێدا ئەڕوا،شوارکەکیش لەو بیەی بکاتۆ هەرچی ئەو شوارکەی لێبدا ئەبیتە کەر،سەعدیش ئەوە گوێ دایتێ،ئەوان هەر فڕین،هەندەك پەلکە بی کەتنە خوارێ دەبن پێیانی دان و شوارکەکیشی لە بیێ کردۆ بەسەر ئاوێدا رۆیشت و چۆ کن مارێ مەنیجاییێ ناو عاشقان،هەر ئێکی شوارکەکی لە عاشقان دا ، هەموو بوونە کەر، بووە زۆرە زۆڕێ کەران،مەنیجاییێ لەسەر قەسرێ هاراند گۆتی ئەوانە لۆ وەلێهات؟سەعدی شوارکەکیش لەوێ دا ئەویش بووە ماکەرەکە لێو شۆڕ،بردی لەبن دەرگەی بەستۆوە،وەی گۆتێ ئەگەر تۆبەیەکەی سەری راوەشینەئەگەر تۆبەش ناکەی هەر ئیوهەبە.مەنیجاییێ سەر راوەشاند،گۆتی تۆبەیەکەم،شوارکەکی دی لێدا بۆوە مەنیجاییێ گۆرین،شوارکەکیشی لەعاشقان داوۆ هەمان وەکی خۆ لێهاتۆ،هەر کەسە بابا بوو ئەشیایان خرکردۆهەراتن و کەس نەبووە برایێ کەس، ئەوێندەرێیان چۆل و هۆل کرد.

ئەوجا سەعدی گۆتە مەنیجاییێ ئەمن برایەکا هێیە دەبی دەگەرم بێی بزانین چیلێهاتیە؟

چوون لەسەر مافووری دانیشتن گۆتیان قـوم بـە ئیزنـت یـا اللـه لـۆ سەر ماریٚ سەعیدی،چوون لەسەر خـانی هەرنیشـتن ، چـوونە مـاریٚ سەعیدی،خەبەریان دا سەعید پاشای گۆتیان ژنەك و پیاوەك هاتینە لەو شكرەی لەو رەنگەی،سەعید پاشـای وەگـۆ بیـان هیـنن، چـوونە كنـی بـەخێرهاتنی كـردن و گۆتیـە قـازەوانی دوو قـازان سـەر بـبڕە، قازیان سەر بـڕین و نانیـان خـوارد، چـوون دەسـتان بشۆن،سـەعدی وەگـۆ ئـەمن دەسـتیٚ پاشـایە شۆم،پاشـاش گـۆ ئـەمنیش دەسـتیٚ مێوانیـە شـۆم،روحمیان لـۆ ئێكـدی بزووت،ئێـك لـەوی ئێـك لـەوی هـەردووكان باسـك هەركردن،تەماشـەیان كردنـەو سـەعدەو ئـەویش سـەعیدە، ئامێزیـان لێكـدان ئێكـدیان ماچـكردو پێـك شـادبوونۆ،جمعەكی لـەكن ئێكـدی بوون،سـەعدی وەگۆتـە سەعیدی:برام نەچین سەرەكی پیرە بـاوی بـدەین، داخـوا مایـە یـان نا،سەعیدی گۆ باشە ئەچین،چوون جلكیٚ دەروێشانیان دەبەر كـردن و لەسەر مافووری دتنیشـتن وەڕێكـەتن لـۆ مـاریٚ باوی،لەسـەر بـانی مـاریٚ بـاوی هەرنیشـتن ەو بـە كۆسـپاندا چـوونە خواریٚتەماشـایان كرد،داك لـەو بـەری تەنـدووریٚ دانیشـتیە جـووش لـەو بـەری،باویش كۆرە بووە هەرە بـۆرژا، چـوون گۆتیـان مێـوانی نكۆیینـە،باوی گـۆت یـاخوا بـەخێربێن سەرچـاوان،داكیٚ روو گرژبـوو وەی گـۆتنیٚ لەچـە گەرێن؟ئەوانیش گۆ فەقیرو مار وێرانین، سـەعدو سـەعید دانیشـتن ، باوی وەگۆ ئەمن بۆنەكە هەند خۆشا لۆدیٚ هەناوم فێنك بوونۆ،چـاوم چـاك بوونۆ،گۆتیـان ئۆبـاو ئەمـە سـەعدو سـەعیدین، داكیٚ خیانـەت

لەمەش کردو لەتووشی کرد، ئیدی بەیەک شاد بوونۆ و باویان چـاوی چاک بوونۆ، هەرستان داک و جوویان پێکۆوە سۆتاندن.

ئەمنیش هاتمۆوە و چم پێنەبڕا.....

---

ئەو حەکایەتەش خەسووم نەفیسە ئەحمەد کاکەمین، بەرەحمەت بیٚ بۆی گێڕامۆوە لەساری ١٩٨٣.

# خەزێنە

هەبوو نەبوو، کەس لە خوای گەورەتر نەبوو، کەس لە عەبدی درۆزن روو رەش تر نەبوو، بەقسیێ ئەو ماوەستایەی ئەمن گوێم لێبووە ئەریێ:

لەگوندەکی لاپەڕگە ژنەك و پیاوەك وێکڕانە ژین، پیاوەکە ئیشی جۆتیاری بوو، گایەکی رەش و ئێکی سۆری هەبوون،رۆژێ هەرەستا ئەچووە جۆتی، پارچە زەویەکە باشیشی هەبوو، رۆژەکی لەوەختی جۆتکردنیێ، گاسن دەکوپەکی ئارا،وەکی تەماشەی کرد، کوپەکی گەورەی پڕی زێڕ،تازە بەسەر خەزێنیێ هەربوو،جۆتی بەرەڵلا کرد،تەماشەی کردیێ کابرایەکی دوور لەوی بەسواری بەوێدا ئەڕۆیشت، دەدری خۆیدا گۆتی : هەبی و نەبی ئەو سوارەی ئەمن دیتیمە وەکی خەزێنەم هینایتە دەریێ، وەچاکە بانگی بکەمیێ ، نیوەی خەزێنێی بدەمی، وەبی لەکن خەرکی بەحس نەکا، بانگی کابرای کردو گۆتی: هۆ کابرا ،وەرە ئێرە ئیشم پێی،کابرا هات نێزیکی بووەوە ، جۆتیاری گۆ وەڵلاّ نای دەمیێ، کابرای سوار گەیشتە کن جۆتیاری گۆتیە جۆتیاری لۆ بانگت کردم؟جۆتیاری

گۆت چ نەبوو نە، ئەوە گۆتم داخوا(گای سۆر باشترە یان گای رەش؟)،كابرای سوار گۆت، جامن چسوانم خۆئەمن ساحێبی گایان نیمە، سوارەكە رۆیشت،ئەو جارەی دری كەتۆ خەتەریٚ، گۆتی مابەچەزانن ئاگای لێنەبووە، دیسان بانگی كردۆوە،كابرا دیسان هاتۆ، گۆتی ها جۆتیار چیە دیسان لۆ بانگت كردمۆ؟جۆتیار دیسان پشێمانی بۆوە.گۆتی هیچ نیە هەركۆتم بزانم ئەتوو قەتت ئەمن دیتیمە لە چ جێیان؟كابراش گۆت : ناوەڵلاقەتم نەدیتی.

كابرا توورە بوو و رۆیشت.

وەكی كابرای سوار رۆیشت، جۆتیاریش مشاوەش بوو ،هەرستا كوپە زێری دە بەرامپیلیٚ وەرپێچاو گەڕاوە ماریٚ و لەجێیەكی دانا،چوو گایان وەبەستی ،ژنێش تەماشەكردیٚ،گۆتی بەلاش نیە مێردم هەندە زوو گەڕایتۆ،چوو تەماشەی پرێسكێی كرد،وەكی لێراما دیتی زێرە، زێری لەپرێسكی بەتار كردو بەردەكی دەناو پرێسكیٚ نا، جۆتیار هاتۆ ،گۆتی ژنیٚ ئەمنا چمە ماریٚ پاشای ، ئەچم ئەویٚ دیاریێی لۆبەم.

جۆتیار چۆ ماریٚ پاشای ، خورامان تێوەڕاخوڕی، گۆتیان كێواچی؟گۆتی دیاریەكم لۆ پاشای هینایە، خەبەریان دا پاشای گۆتیان جۆتیاری دیاریەك لۆ هینای، پاشای گۆت لێی گەڕێن بابیٚ، چۆ ژۆریٚ پاشایدانیشت، پاشای گۆتە خورامان دە پرێسكیٚ بكەتۆ بزانن چی تێدایە؟وەكی خورامان كردۆ، تەماشەیان كردیٚ بەردەكی

گەورەیەو هیچی دی نیە، جۆتیاری خۆ تێك نەدا،گۆتی پاشام خۆشبی ئۆ چەند رۆژە بەخۆ بەژنێن مناقەشەیە ژنمە رێ ئەو بەردە (هۆقەك) بی، ئەمنیشە رێم هۆقەك نابی، ئەلعانێ پێم خۆشە ئەمە لەبەرێك ببەنە دەرێ،داخوا هۆقەك ئەبی یان نا.

پاشا تووڕەبوو، گۆتی بڕۆن ئەو بێقیمەتەی دەزیندانی کەن،جۆتیاریان دەزیندانێ کرد، خوراماش چاودێریەکرد،داخوا چەرێ،جۆتیاریش لەخەفەتان هە دەستی بائەدان وەکی بازنەکێی دەست تێك دەئاراندن،هە فکریەکردنێ ئەیگۆ ئەو لیرانە هەموو ئەهەندەبوون ، چیان لێهات؟خورامانیش ئاگا لێبوو، چوونە سەر سەری پیلیان گرت و هەریان ستاند، گۆتیان ئەوە چتە ئەو دەستانە لۆ ئیوهە لێئەکەی؟جۆتیاریش وەگۆ: وەڵا ئەوە فکر لەوەیەکەمۆ ئەرێم سەری پاشای هەندەی گەورەیەو داکیشی هەندا کچکۆکەیە، کووی تێوە هاتیتە دەرێ؟ ئەو قسانە لەکن پاشای ئەکات، پاشاش زۆری لێ توڕابی، ئەرێ بڕۆن گیشە گیایەکێ بینن هەریدەنە ناوێ بابسۆتێ، دەناو گیشە گیایێ ئیشکیە نێن،ئاگری تێبەرەدەن،وەختەکی گەرمیاییەگاتێ ئەرێ دەرم بینن هەموو شتو پێئەرێم، دەیهینتنە دەرێ، ئەرێن ئەوجا قسەکەن لۆ بکە بزانین ئەتوو چت دیتیتۆوە؟

جۆتیـاریش ئـەرێ گیشـە گیـا سـۆتا؟ پاشـاش ئـەرێ ،ئـەرێوەڵڵا هەمووی سۆتا،جۆتیارەرێ خۆ دەنـاو دابامـە ئەمنیشـە سـۆتام،ئێجا ئەمن لۆ بسۆتێم؟

پاشاش ئەرێ ئازادی کەن ، ئەو زەلامـەی هـیچ لەسـەر نیـە، ئەبیتـە پێکەنین و جۆتیاری ئازادەکەن.

جۆتیـاریش ئەچـیتۆ مارێ،لـەرێێ هەرپرتـە پرتیتـی، ژنـی بـەدوودا دێ، بانگیـەکات ئـەرێ پیاویژگـە ئـەها کوپـە زێـڕ تۆتـەو جۆتیـار درخۆشەبی و هەتا مان ژیانەکی خۆشیان رابارد،

ئەمنیش چ پێنەبرا.

---

ئەو حەکایەت  خوالێی خۆشبی: حاجی قادری عەولابەگی لۆێ گێرامەوە.

# فەرهەنگۆك

*– ئاچم: ئەوا دەچم،وادەچم.

*–ئادێم: ئەوا هاتم، واهاتم.

*–ئارێم: وا دەڵێم .

*–ئووهە:ئەوها، وەها، ئاوا.

*–ئیوهە:ئاوا، بەم جۆرە.

*–ئەوێش:واتا ئەو، بۆ ژنان بەکاردێ.

*–ئەویش : ئەو، بۆ پیاوان بەکاردێ.

*–ئەلبیسە: جلوبەرگ.

*–ئەی رێتێ: پێی دەڵێ.

*–ئێدی: ئەوەی تر،ئەوی دیکە.

*–ئیستەرەم:ئێستا، هەنووکە.

*–ئەو سرپەی: ئەو نهێنیەی.ئێگدی: یەکتر.

*ئەمیش: ئەمنیش، منیش.

*–ئەشکەفتە: ئەشکەوت.

*–ئەو خێماهێ: ئەو خێمەی کەلە دوورە.

*–ئیوهە: ئەوها، ئاوا، بەم جۆرە.

*–ئێگدی بناسنۆ: یەکتر بناسنەوە.

*–ئەو خێماهێ: ئاماژەیە بۆ خێمەیەکی دوور.

*–ئەوی وەگۆ: ئەو وای ووت، بۆ نێر

*-ئەویَ وەگز: ئەو وای ووت، بۆ میَ.

*-تۆین باز: واتا فێڵ باز، كلاو چی.

* * * *

*-بارنج: بێبەشكردن لە میرات.

*-بنیا دەم: مرۆڤ.

*-بناوان: شوێنی هەڵبەستنی ئاو،ژنێك سەرپەرشتی ماڵ بكات.

*-بەو میسالی: لەو جۆرە.

*-بەو تەرحە: بەو جۆرە، بەم شێوەیە.

*-بن كەوش : بن پیل، ژێر باڵ.

*-بزووت: جووڵا، بەرێكەوت.

*-بشێرۆ: بشارەوە.

*-بردۆ: بردیەوە ماڵ.

*-بسورمان: موسوڵمان.

*-بادیلۆكە: جامی ئاو خواردنەوە.

*-بەهانە:هەنجەت، بیانوو

*-بەرچێر:پێشەوەی كراسی ژنان.

*-بەهاییی: وەخۆ هاتەوە،بەئاگا هاتەوە.

*-بیژی مۆتە: كەسێكی زیتەڵ، بەتوانا.

* * * *

*-پێویا: پێویستی پێبوو.

*-پسسساینە:تۆقیون،ترساون.

*-پسیلە: پشیلە.

*–پێوەبووینە: تووش بووینە.

*–پێیان بەغاریێ وەنا:رایان کرد،غاریان دا.

*–پەشتەمار:پەشتەماڵ،پەڕۆیەك،خاولیەك.

* * * *

*–تیسکە تاو: تروسکایی رۆژ.

*–تۆریە:جۆرێك،توورەکە.

*–تەرسمات:تەلەسمات.

*–تەقەت کردن: شاردنەوەی شتێك.

*–توولە:سەگی گچکە،

* * * *

*–چسوانین: چوزانین.

*–چشتاقە ئەشیا: هیچ شتێك،هەرچی شتە.

*–چەرێی: چی ئەڵێی.

*–چوو و لێوەشێرم:چیتان لێ بشێرمەوە.

چاکەی: چی ئەکەی.

*–چەلەنگ: لێوەشاوە، لێهاتوو.

* * * *

*–حیسان: مرۆڤ، ئینسان.

*–حەیوانی داکرد: مەڕو ماڵات بردنە ناو هۆڕ.

*– حورمە:ژن، نامەحرەم.

* * * *

*–خان:جێی حەواندنەوەی جاران کاتێ لەکاروانکردن لایان دەدا.

*–خۆشترەویٚ: خۆشتری دەویٚ.

*–خەنی:کەیف خۆش، دڵخۆش.

*–خەبەری بۆوە: لەخەو هەستا.

*–خەزنە: دیتنەوەی زێڕو زیوێکی زۆر لە ژێر زەوی.

*–خوراماں تێوەڕاخوڕی:پاسەوانەکان دەنگیان داو ئاگاداریان کردەوە.

* * * *

*–دانووسینم:چاوەڕوانیکردی شتێك، خۆ شاردنەوە.

*–داتنۆ: دەهاتنۆ.

*–دەبەری هەرما: لەخوارەوە سەیری کرد.

*–دەگە: دەگەر

*–دەپاریان کرد:یەکێك ژنیان بۆ بردبێتە ژێر جێگا.

*–درك: دڵی باڵندە.

*–دەبەرییێی دابوو: لە گیرفانیدا بوو، لەباخەڵیابوو.

*–دێرەکە: مێیەی سەگ.

*–دەرك گارەدان: دەرگا کلیل دان.

*– دڕی: جۆرە دڕکێکە.

* * * *

*–رۆرە: رۆڵ.

*– رەشە شیو: شیوێکی زۆر،زۆر جۆر لە خواردن.

* * * *

*–شۆق: شەوق، رووناکی.

*–شکر: وێنە.

*–شوانە وێرکە:یەکێك ئیش و کاری هەر شوانەتی بوویێ.

*–شەویێ دی: شەوی رابردوو.

*– شەوا دی: دوێنیێ شەو.

*– شەو ترادی: پێریێ شەو.

*– شرقژنی لێوەهینا: نیشانەی پێکا، تەقەی لێوەهینا.

*– شواڕك: قەدی باریکی دار.

*　*　*　*

*– فرتەفرت: پرتەو بۆڵە.

*–فرانکە، فلآنەکەس

*–فەتاڕەت: لەناو چوون.

*　*　*　*

*–قولماتیێ نەکەی: دەنگیێ نەکەی، قسەنەکەی.

*–قسێم لۆبکە: قسەم بۆ بکە.

*–قمەك: قومە ئاوێك.

*–قول: رەش پێست،لێرە بەمانای بەندە دیێ.

*　*　*　*

*–کاغەزەکم وێیە: نامەیەکم لایە.

*–کۆسپان: قالدرمە، پەیژە.

*–کسۆك : سەگ.

*– کەڕەنگر: گەلای داربەڕووی وشك بوو.

*–کێرکەر: خزمەتکار،کارەکەر.

*– کۆرەی کە: کوێریکە.

*–کۆرە مەرگی: ژیانێکی ناخۆش، مەمرەو مەژی،کۆڵە مەرگی.

*–کێواچی : بۆ کوێ دەڕۆی؟.

*–کیوەختی : چ کاتێك؟.

*–کوڕیژگە: کورتکراوەی کوڕۆکە.

*–کەرتك کە: بیکە دوو پارچە.

*–کتك : پشیلە.

*–کوچەکەر : پیرەکەر.

*–کەورکردن: جیاکردنەوەی گۆشت و پێست.

*– کیان مایە: کێیان ماوە؟.

*–کەیفا خۆتە: کەیفی خۆتە، چۆنت پێباشە.

* * * *

*–گر: گڵ، خۆڵ.

*–گور: گوڵ.

*–گرواندن: جیاکردنەوەی گۆشت و پێست.

*–گۆرین: کۆن ، جاران

* * * *

*–لۆیەبەی: بۆی ئەبەی.

*–لەی وابی: لای وابوو.

*–لەسەر دەستێ خۆ ژی:خۆی خۆی دەژێنێ.

*–لێراهێ: لەولاتر بۆ شوێنێکی دوور.

*–لەتۆپاش: لەمەو دوا.

*–لگێن: خشتێك.

*–لەزگ بوو: خەریك بوو.

*– لە هیکڕا: لەناکاو.

* * * *

*–مار داریکەر:کەسێکی کاسب، کەسێ خەمی ماڵ و حاڵی خۆی بێ.

*–مەدریس: مەجلیس.

*–مێ پێش : نەیە پێش.

*–مگێز: حەز، ئارەزوو، پێم خۆشە.

*–مغەیری : ئەشکەوت.

*–مۆرکردن: نووستنی مەڕو ماڵاَ،

* * * *

*–نەجێیانە بیتێ: جێگایان نابێتێ.

*–نایێرم:لێناگەڕێم، ناهێڵم.

*–نیقاش: روو پۆش

*–نیقاب: پەردە

*–نوانەوە: نەرم بوونەوە لەناو ئاو.

* * * *

*–هەرات: هەلاَت.

*– هەڕەت: سەردەم.

*–هەلاکۆ: لاچۆ،

*–هەرێن: بەڵێن، پەیمان.

*–هاتمۆکنت: هاتمۆ لات.

*–هەرەتان: بەلاَو سەر ئێشە.

*–هاڕژن: قوڵپی گریان.گریانی بەدەنگ.

*–هەر بێنیێ: هەر ڕۆژەی، هەر جارەی.

*–هاڕاند: هاواری کرد،بانگی کردن.

*–هۆقە:کێشێکە، واتا چوار کیلۆ،بەچوار کیلۆ دەگوترا هۆقە.

* * * *

*–وارێمە: پێی دەڵێم.

*–وێیدەن، پێی بدەن، بیدەنێ.

*–وێکڕان: بەیەکەوە.

*–وەلحاسری کەلام: بەکورت و کرمانجی.

*–وەدووی راچوو: بەدوایدا چوو.

*–واك : هێن، هەرامە.

*–وانەك: هێن و هەرامە.

*– وەی برێنێ: پێی بڵێن.

*– واکی وەگۆ: ئەوی وەگۆت، بۆ نێر.

*– واکێ وەگۆ: ئەوێ وەگۆت، بۆ مێ.

* * * *

*–عەییامەك: چەند ڕۆژێك.

*– عازمان: یەکێك زۆر ئازاری هەبێ.

*–عەلەل ئەجەل:بە زووترین کات.

*–عەگید: پیاوی ئازا، لێوەشاوە، مەرد.

